سون می هوانگ



# ئەو مریشکا دڤیایی بفڕیت

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

دیان جەمیل

# ئەو مریشکا دڤیای بفڕیت

رۆمان

سون می هوانگ


- نافێ پەرتووکێ ب کوری (زمانێ ڕەسەن): Madangeul naon amtak
- نافێ پەرتووکێ ب ئینگلیزی: The hen who dreamed she could fly
- وەرگێڕان بۆ ئینگلیزی: چی یونگ کیم
- وەرگێڕان ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت
- دیزاینا بەرگی: فەرسەت زوبێر
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل
- تیراژ: 500 دانە
- بها: 5000 دینار

ل ڕێڤەبەریا کتێبخانێن گشتی ل پارێزگەها دهۆکێ ژمارا سپاردنێ 2157 یا سالا 2016 پێ هاتیەدان

رۆمان

سون مى هوانگ

# ئەو مریشکا دڤیاى بفڕیت

وەرگێڕان ژ ئینگلیزى

دیان جەمیل

# بوچی مە ئەڤ رۆمانە وەرگێڕا؟

رۆمانا "ئەو مریشکا دڤیای بفڕیت" ئێکە رۆمانێن کلاسیکی یێن کوریا باشوور کو نڤیسەرا وێ مینا چیرۆکێن "کەلیلە و دومنە" ل زارێ گیانەوەران بەحسێ وان دەرد و ئازاران کریە یێن پتریا خەلکێ کوریا نەشێن ب ئازادی دەربڕینێ ژێ بکەن.

هەرچەندە ئەڤ رۆمانە بەهرا پتر دچیتە د چوارچووڤەیێ ئەدەبێ زارۆکان دا لێ دگەل هندێ ژی بوویە رۆمانەکا جیهانی و پتر ژ دوو ملیون دانەیان ژێ هاتینە فرۆتن و بۆ نێزیکی 28 زمانێن جیهانێ هاتیە وەرگێڕان ژبەر هندێ مە بزاڤ کریە خواندەڤانێ مە یێ کورد ژی ژ خواندنا وێ بێبەهر نەبیت و پەرتووکخانەیا کوردی پێ زەنگین ببیت.

ئەڤ رۆمانە سەرهاتیا مریشکەکێ ڤەدگێریت کو دناڤ قەفەسکەکێ دا هاتیە زیندانکرن و رۆژانە هێکان بۆ خوەدانێ خوە دکەت، لێ خەونا وێ یا سەرەکی ئەوە ئەوژی رۆژەکێ ل سەر هێکەکا خوە کورك ببیت و ب چاڤێن خوە بینیت دەمێ هێکا وێ دبیتە چیچەلوك، ژبەر هندێ بزاڤان دکەت برەڤیت و ژیانا خوە یا مای ل چولی ب ئازادی ببورینیت  و خوە ل بەر هەمی وان ئاستەنگان بگریت یێن دکەڤنە د رێکا وێ دا.

ئەڤ رۆمانە باشترین نموونەیە ل سەر وێنەکرنا ئازادیا کەسایەتی و رەڤین ژ وی کەتوارێ مرۆڤ تێدا نەشێت ب دروستاهی بگەهیتە هەمی خەون و هیڤیێن خوە، لێ ئەڤ رەڤینە هندێ ناگەهینیت کو ژیانا داهاتی دێ یا بێی مەترسی و ئاریشە بیت. ئانکو هەروەکی چیرۆکا وان گەنجان یێن بزاڤێ دکەن وەلاتی بجهـ بهێلن و قەستا وەلاتەکێ دی دکەن داکو

ژیانەکا ئارام و بەختەوەر ببورینن، لێ ل ڤان وەلاتان ژی ئەو ڕی ب ڕی ژیانەکا دی یا سەخت و ئالۆز دبن و دوور نینە هەر ب ڕێکێ ڤە وەغەرا خوە تەمام نەکەن یان گیانێن خوە ژ دەستبدەن.

ئەڤ پەرتووکە ئێکەم سەربوورا من یا وەرگێڕانێ یە دگەل رۆمانێ نەخاسم ژ زمانێ ئینگلیزی، ژبەر هندێ من دڤیا رۆمانەکا هوسا بیت کو ژبلی ناڤەرۆکا وێ یا جوان، ئاستێ زمانێ وێ یێ ئەدەبی ژی نە گەلەك یێ ب زەحمەت و گران بیت، هەروەسا پتر نێزیکی ئەدەبێ زارۆك و سنێلەیان داکو ل داهاتی ببیتە ڕێخوەشکەرەك بۆ کارێن باشتر و مەزنتر.

دیان جەمیل

29 ئیلونا 2016

## ناڤبڕا یەکێ:

# ژ نوکە وێڤە ئەز چ هێکێن دی ناکەم

هێکا وێ گرێلبوو هەتا گەهشتیە دەڤ سیمەیێ ل بەر سینگێ قەفەسکا وێ، سونێ دیت ئەڤ جارە هێکا وێ نە وەکی هەر جار یا سپی یە بەلکو هندەك چپکێن خوینێ یێن پێڤە. ژبەرکو ئەو دوو ڕۆژ بوون وێ چ هێك نەکرین، باوەرنەدکر ئەو دێ جارەکا دی شێت هێکان کەت، لێ ئەڤ هێکا وێ ژی یا بچووك و خەمگین بوو.

نابیت ئەڤ چەندە دووبارە ببیت، ب ڤی ڕەنگی وێ دەربڕین ژ تۆڕەبوونا خوە کر.

ئەرێ تو بێژی ئەڤ جارە ژنا جووتیاری ڤێ هێکێ ژی دگەل خوە ببەت؟ چونکی بەری نوکە ژی وێ هەموو ئەو هێك یێن برین ئەڤێن سونێ دکرن. ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە کو ئەو دێ ڤێ هێکێ ژی بەت فرۆشیت. ژنا جووتیاری هەموو گاڤان گازندە دکرن کو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ مریشکێن وێ هێکێن بچووکتر دکەن. تو بێژی ئەڤ جارە ئەو ڤێ هێکێ بهێلیتە ل جهێ وێ ژبەرکو هێکەکا کرێتە؟

سونێ ئەڤرۆکە نەشێت خوە ل سەر پێن خوە بگریت. ئەڤ چەندە ژی نەیا سەیرە چونکی ئەو شیا ڤێ هێکێ بکەت بێی کو وێ تشتەك خوار بیت. سونێ یا مەندەهۆش بوو کا وێ چەند هێك هێلاینە د هێلینا خوە دا، هیڤیا وێ ئەو بوو ئەڤ هێکە ببیتە دوماهیك هێك.

سونێ ب کەسەر ڤە تەماشەی ژ دەرڤە دکر. ژبەرکو قەفەسکا وێ نێزیکی دەرگەهی بوو، هەر گاڤا وێ ڤیابا ئەو دشیا ل پشت تێلێن سیمەی تەماشەی ژ دەرڤە بکەت. دەرگەهێ قەفەسکا وێ هەموو نەدکەڤتە جهێ خوە و باش نەدهاتە گرتن، ژبەر هندێ ب ڕێکا وێ ڤالاهیا پەیدابووی

ئەو دشیا دارا خەرنۆفێ یا ژ دەرڤە ببینیت. سونێ گەلەك حەز ژ دیمەنێ ڤێ دارێ دکر و پێڤە هاتبوو گرێدان. وێ قەت گازندە ژ بایێ زڤستانێ یێ تەزی و بەفر و بارانا ل هاڤینێ دحەلیایی و دهاتیە د قەفەسکا وێ ڤە نەدکرن.

سونێ مریشکەکا هێککەر بوو، ئانکو ئارمانج ژ خوەدانکرنا وێ ب تنێ ژ بۆ بەرهەمئینانا هێکان بوو. بەری سالەکە ئەو د ڤێ قەفەسکێ دا هاتیە زیندانکرن، ژ هینگێ وەرە ئەو چ کارێن دی ژبلی کرنا هێکان ناکەت. ئەو نەدشیا ل وان دەوروبەران بگەڕیت یان ژی پەڕێن خوە ڤەکەت، هەتا ئەو نەدشیا ل سەر هێکێن خوە ژی ب ڕوونتە خوارێ. ئەو چ جاران ژ قەفەسکێ نەدەرکەڤتبوو، لێ وێ ددیت ژ دەرڤە مریشکەك یا دگەل چیچەلۆکێن خوە یێن جوان ب ئازادی دهێت و دچیت، حەزەکا نهێنی ل دەڤ سونێ پەیدابوو کو ئەو ژی ل سەر هێکەکێ کورك ببیت و تەماشەی وان خۆلەکان بکەت دەمێ چیچەلۆکا وێ یا بچووك ژ هێکێ دهێتە دەرێ.

ب ڕاستی ئەڤ چەندە خەونەکا ئەستەم و مەحال بوو، چونکی قەفەسکێن وان ب شێوەیەکێ سەرنشیڤ بەرەڤ پێشڤە هاتبوونە دروستکرن و هەر دەمێ وان هێکەك دکر، ئەڤ هێکە دا گرێل بیت هەتا دگەهشتە لایێ دی یێ قەفەسکێ و دیوارەکێ سیمەی دناڤبەرا وان و دایکێن وان دا هەبوو.

دەرگەهـ هاتە ڤەکرن و جووتیار هاتە د ژوور ڤە و یێ عەرەبانەکێ ب دەستی دهاژووت.

"تێشت هات."

"ئەز گەلەگ یا برسیمە، دێ لەزێ بکە خوارنێ بدە مە."

"دەنگێ قد قدا مریشکا ب سەر قەفەسکان کەڤت."

دەمێ جووتیاری ئالف ددا وان، د بەر ڕا دگوتێ: "پێدڤیە هوون هژمارەکا هێکێن مەزن بۆ من بکەن چونکی جارەکا دی بهایێ ئالفی یێ گرانبووی."

سونێ چ پیتە ب ئاخفتنا وی نەکر بەلکو هەر یا بەردەوام بوو ل سەر تەماشەکرنا وێ جیهانا دکەڤتیە پشت دەرگەهێ قەفەسکێ کو نوکە ب تەمامی یا ڤەکری بوو. ئەڤە دەمەکێ درێژ بوری و هێشتا ئەو یا برسی یە. نوکە ئەو حەز ناکەت چ هێکێن دی بکەت.

هەردەمێ هەڤژینا جووتیاری دهات هێکێن وێ دبرن، دلێ وێ تژی خەم و نەخوەشی دبوو. ئەو شانازیا وێ ژبەر کرنا هێکان ب خوە دبر هەر زوو دا بۆ وێ بیتە نەخوەشی. پشتی بورینا سالەکێ ل سەر ڤێ چەندێ ئەوێ هەست ب پۆسیدەییێ دکر ژبەرکو ئەو خوە نەشێت ب پەرێن خوە ژی وان هێکان هەلبگریت یێن کو ئەو ڕۆژانە دکەت، هەروەسا وێ نەدزانی کا هەڤژینا جووتیاری پشتی ڤان هێکان دکەتە د سەلکەکێ دا بۆ کیڤە دبەت.

ژ دەرڤەی قەفەسکێ جیهانەکا گەش و پڕ هیڤی هەبوو، ئەو دارا خەرنۆفێ یاکو دکەڤتیە لایەکێ حەوشێ، گولێن وێ یێن ڕەنگ سپی ڤەدبوون و دیمەنەکێ جوان پەیدا دکر. بێهنا گولان دگەل دندکێن خوناڤێ تێکەل دبوو و بەرەڤ قەفەسکێ ڤە دچوون و دلێ سونێ پڕ دکر. سونێ ڕابوو ڤە و سەرێ خوە دناڤ سیمەیێ قەفەسکێ دا بر، ل ڤێرێ حەفکا وێ یا ڕەنگ پیڤازی و ڤالاێ ژ پەڕان دیاربوو.

جارەکا دی وەرزێ بهارێ هات و دارا خەرنوٚفێ ژی دەست ب خەملا خوە کرەڤە و گولێن نوو بشکڤین. سونێ حەسیدی ب وێ دارا خەرنوٚفێ دبر، دەمێ وێ چاڤێن خوە پیچەکێ دنقاندن و تەماشەی دارێ دکر، وێ ددیت بەلگێن وێ یێن کەسك هندەك بشکوژێن بێهن خوەش یێن هەمبێز کرین.

پشتی بورینا چەند ڕوٚژەکان، دارێ گولێن خوە وەراندن هەروەکی کا چەوا دەمێ بەفر دباریت و دکەڤیتە سەر یەك و پاشی هێدی هێدی دحەلییێت، ب ڤی ڕەنگی بەلگێن داران مانە ب تنێ. ئەڤ بەلگە هەتا هاتنا وەرزێ پاییزێ ژی هێشتا ب دارێ ڤەبوون، لێ ئێدی ڕەنگێ وان یێ زەر بووی و نوکە دەمێ وەریانا وان ژی هاتیە و پێدڤیە ئەو ب ئاوایەکێ ئارام ژ دارێ بوەرییێن.

سونێ یا مەندەهوٚش بوو کا چەوا ئەڤ بەلگە دشێن خوە ل بەر بایێن بهێز و بارانێن بوٚش بگرن و جهێ خوە بپارێزن هەتا وەرزێ پاییزێ دهێت. دەمێ وێ دیتی ل بهارا د دووڤ دا جارەکا دی ئەڤ بەلگە یێن شین دبنەڤە و دەست ب گەشتەکا نوو دکەن، وێ هەست ب خوینگەرمیێ دکر و هزر دکر ئەو ژی دشێت وەکی ڤان بەلگان خوە ل بەر کاودانێن دژوار بگریت.

کولیلکێن داران پشتی شین دبن چیکێن خوناڤێ یێن دناڤ بایی دا و ڕوٚناهیا ڕوٚژێ هەمبێز دکەن، ل دووڤ دا ئەڤ کولیلکە دێ وەرییێن و کەڤنە سەر ئەردی داکو دەلیڤەیێ بدەنە هندەك کولیلکێن دی ل شوونا وان شین ببن. ئەڤە ئەو ڕێکە یاکو کولیلك ل دوماهیێ خوە دکەنە قوربان داکو

هندەك گولێن بێهنخوەش ل جهێ وان شین ببن، سونێ ژی دڤیا وەکی کولیلکێن دارا خەرنۆفێ بژیت.

سونێ باشترین ناڤ بوو ل جیهانێ هەموویێ. سونێ گەلەك ب کولیلکێن دارا خەرنۆفێ یا داخبار بوو و دڤیا کارەکی هۆسا د ژیانا خوە دا بکەت وەکی یێ ڤان کولیلکان بیت، ژبەر ڤێ چەندێ ژی وێ ناسناڤێ خوە کربوو "کولیلك". هەرچەندە کەسێ ب ڤی ناڤێ گازی نەدکرێ و وێ باش دزانی ئەو ب چ ڕەنگان نەشێت وەکی ڤان کولیلکان بژیت، لێ دگەل هندێ ژی ڤێ چەندێ هاریکاریا وێ دکر ئەو هەست ب خوەشیێ بکەت، هەلبەت ئەڤ چەندە نهێنیەك بوو ل دەڤ وێ ب تنێ.

پشتی وێ ئەڤ ناسناڤە بۆ خوە دانایی، ئێدی وێ بەردەوام تێبینییا وان هەموو تشتان دکر یێن ژ دەرڤەی قەفەسکێ ڕوودددان وەك مەزنبوون و بچووکبوونا قەبارەیێ هەیڤێ، هەلاتنا ڕۆژێ و شەڕ و لێکەڤتنێن گیانەوەران دناڤ باخچەی مالێ دا.

جووتیاری گوتێ: "بەردەوام بە، دڤێت تو گەلەك خوارنێ بخۆی داکو هژمارەکا هێکێن مەزن بکەی."

هەر جارا وی خوارن ددا مریشکان، وی ئەڤ ئاخفتنە دووبارە دکر. سونێ ئێدی ژ گوهلێبوونا ڤان پەیڤان بێزار ببوو، ژبەر هندێ چ پیتە ب ئاخفتنا وی نەدکر و یا بەردەوام بوو ل تەماشەکرنا دیمەنێ جیهانا ژ دەرڤەی قەفەسکێ.

باڵندەیێن دناڤ باخچەی دا هەموو د مژوولبوون ب خوارنا تێشتێ ڤە، خێزانەکا مەزن یا وەردەکان ل دور ئامانەکێ داری خڕڤە دبوون دەمێ

خوارن بۆ دهاتە پێشکێشکرن، وان هۆسا سەرێن خوە دکرنە دناڤ ئالفی دا تا وی ڕادەی کوریێن وان بەرەڤ ئاسمانی بلند دبوون بێی کو سەرێن خوە بلند بکەن.

ئەو سەیێ پیر ژی خوە ل جهەکێ نێزیکی وان پەحن کربوو و مژوولی خوارنا خوە یا تایبەت بوو، لێ ل سەر وی یا پێدڤی بوو ئەو خوارنا خوە هەموویێ بنخێڤیت یان ڤەشێریت بەری کو دیکل بهێت خوە ل خوارنا وی بدەت.

جارەکێ دەمێ سەی نەهێلای دیکل خوارنێ دگەل وی بخۆت، شەڕەك دناڤبەرا وان دا پەیدابوو و دیکلی دمەك لێدا و تژی ناڤ چاڤێن وی خوین بوو. جهێ خوارنا دیکل و مریشکێن وی نەیێ ب قەرەبالغ بوو، چونکی نوکە وان چ چیچەلۆك نینن، ژبەر هندێ ئەو گیانەوەرێن یەکانە بوون دناڤ وی باخچەی دا یێن خوارنا خوە ب ئارامی و ب دلێ خوە دخواری.

سەرەڕای ڤێ چەندێ، دیکلی هەموو گاڤان دلێ خوە دبرە خوارنا سەیێ پیر ژی، وی هزردکر نوکە ئەو سەرکێشی باڵندەیێن ڤی باخچەیە ب تایبەت دەمێ ئەو ڕازی نەدبووی بەرەڤ پاشڤە بچیت خو هەکە سەی کوریا خوە ژی لێ بلند کربایە یان لێ ڕەوی بایە.

دیکل باڵندەکێ جوان و بهێز بوو، وی کوریەکا درێژ و کۆفیکەکا سۆر یا بلند و دمەکێ تیژ هەبوو، ئاوڕینێن وی یێن دژوار جهێ ترسێ بوون بۆ گیانەوەرێن دی. وی ل هەموو سپێدەهیان بانگ ددا، پشتی هینگێ

دگەل مریشکان دا دەست ب گەڕیانێ کەن ل وان بیستانێن دەوروبەری مال.

هەردەمێ سونێ تەماشەی جهێ مریشکێن باخچەی کربایە، ئەو نەدشیا خوە ل بەر وی دیمەنی بگریت، وێ پتر هەست ب بێهنتەنگیێ دکر ل پشت وی سیمەیێ ئەو ل پشت هاتیە دورپێچکرن. وێ ژی حەز دکر نوکە ئەو دگەل ڤێ کۆما مریشکان و دگەل دیکلی چەری بایە و پاشی ل سەر هێکێن خوە ڕوونشتبایە خوارێ.

هندی وێ سەرێ خوە دناڤ سیمەیێ ل دورماندوری قەفەسکا خوە ئینابایە دەرێ، ئەو نەدشیا خوە بگەهینتە وی باخچەی یێ کو وەردەك و سەیێ پیر و دیکل و مریشك لێ دژیان، ئەڤان بزاڤێن بەردەوام چ مفایێ وێ نەدکر ب تنێ ئەو نەبیت پەڕێن ستۆیێ وێ ژێڤە دکرن.

وێ بەردەوام گازندە دکرن و دگوت: "بۆچی ئەز دناڤ قەفەسکەکێ دا هاتیمە زیندانکرن ل دەمەکی مریشکێن دی ب دلێ خوە دناڤ باخچەی دا دهێن و دچن؟"

وێ نەدزانی کو ئەو دیکل و مریشکێن ژ دەرڤە ژ جۆرێ باڵندەیێن ناڤخۆیینە و ژ مریشکێن ناڤخۆیی پەیدابووینە. هەروەسا وێ نەدزانی کو هێکێن ئەو دکەت ژ لایێ دیکلی ڤە نەهاتینە ئاڤزکرن ژبەر هندێ نابنە چیچەلۆك خوە هەکە ئەو بۆ ماوەیەکێ چەند درێژ ل سەر بڕوونتە خوارێ. دبیت هەکە وێ ئەڤ ڕاستیە زانیبایە، ئەو دا ب یەکجاری دەست ژ ڤێ هیڤیێ بەردەت و ئێدی خەون ب هندێ ڤە نەددیتن کو جارەکێ ئەو هێکەکا خوە هەمبێز بکەت هەتا ببیتە چیچەلۆك.

وەردەكان خوارنا خوە ب دوماهی ئینا و پاشی چوونە ناڤا وی باخچەی دكەڤیتە پشت دارا خەرنوٚفیٚ و ل بن سیبەرا ویٚ ڕوونشتنە خواریٚ. یەك ژ تیٚشكیٚن وەردەكان پەڕیٚن جوان هەبوون و ل دوماهیا وان دچوو، سەریٚ ڤیٚ تیٚشكا وەردەكا كەهی وەكی بەلگیٚن دارا خەرنوٚفیٚ یێ كەسك بوو، ژبەر هندیٚ ئەو نە وەكی وەردەكیٚن دی بوو و دبیت هەما ئەو هەر وەردەك نەبیت، لیٚ ئەو وەكی وان هیٚدی ب ڕیٚڤە دچوو. سونیٚ نەدزانی كا چەوا ئەڤ تیٚشكا وەردەكی یا كووڤی هاتیە دناڤ باخچەی دا و دشیٚت دگەل وەردەكیٚن دی بژیت.

هیٚشتا بەریٚ ویٚ ژ دەرڤە بوو و ئەو مژوولی تەماشەكرنا وان دیمەنان بوو یێن ویٚ ل پشت سیمەی ددیتن دەمیٚ جووتیاری دەرگەهیٚ قەفەسكا ویٚ ڤەكری داكو خوارنیٚ بدەتیٚ. دەمیٚ وی سەریٚ خوە ئینایە د ژوور ڤە، وی دیت هیٚشتا خوارنا ڕوٚژیٚن بەری هینگیٚ وەكی خوەیە و ویٚ خوە تشتەك نەخواریە.

وی گوت: "ئوٚهـ؟ ئەڤە چیە ل ڤیٚریٚ چیٚدبیت؟"

هەموو گاڤان پشتی وی توٚمك و خوارن ددانایە بەر مریشكان، ئەو دا چیت و هەڤژینا وی دا هیٚت و هیٚكیٚن وان كوٚمكەت، لیٚ ئەڤروٚكە ئەو دیٚ كاریٚ هەڤژینا خوە ژی ئەنجامدەت و دیٚ ژ پیٚش ویٚ ڤە هیٚكان كوٚمكەت.

پاشی وی گوت: "ئەڤە چەند ڕوٚژە ڤیٚ مریشكیٚ چ خوارن نەخواریە، دیارە ئەو یا نەخوەشە." پشتی وی ئەڤ ئاخفتنە گوتی، وی ب بیٚزاری ڤە تەماشەی سونیٚ كر.

وی دەستێ خوە درێژ کر داکو هێکا وێ ببەت، هەر زوو دەستێن وی دناڤ هێکا وێ دا چوون و هەڕشی، ژبەر هندێ وی ئەو هێك هاڤێت. سونێ مەندەهۆش ما، ڕاستە وێ دزانی کو هێکا وێ یا بچووك و کرێتە لێ وێ قەت ئەو هزرە نەدکر کو هێکا وێ دێ یا نەرم بیت، چونکی هێشتا قەلپێ وێ ڕەق نەبوویە. ژبەر هندێ جووتیاری ئەو هێك پەرچقاند و هاڤێت.

ب دیتنا ڤی دیمەنی، سونێ هەستپێکر دلێ وێ بۆ دوو پارچە. خەما وێ یا هەرجار دەمێ هێکێن وێ ژ وێ دهاتنە دوورکرن هندی خەما وێ یا ئەڤرۆکە یا مەزن نەبوو. ئەو نوکە د جهێ خوە دا یا هشکبووی و خەمان ئەو یا هەڕشاندی، ب ڕاستی ئەو ژی مریشکەکا بەلنگاز و بەخت ڕەش بوو.

دەمێ جووتیاری هێکا وێ هاڤێتیە دناڤ باخچەی دا، وێ ب خەمگینی ڤە چاڤێن خوە دانانە سەر یەك ب تایبەت پشتی دیتی هێکا وێ بێی دەنگ ژێ بهێت پەقی و پێکهاتەیێن وێ ب واران وەربوون، هەر زوو سەیێ پیر خوە نێزیکی وێرێ کر و بەرمایکێن وێ هێکێ ئالیستن.

بۆ یەکەم جار د ژیانا وێ دا، ڕۆندك ژ چاڤێن سونێ هاتنە خوارێ. وێ بڕیار دا ئێدی چ جارێن دی هێکان نەکەت، چ جاران!

سونێ ب هیڤیەکا مەزن ڤە تەماشەی حەوشا مالێ دکر، دەمێ وێ تەماشەی وەردەکێن دناڤ باخچەی دا دکر یێ ب ئازادی دژین و ل دەڤ یەك خرڤەبووین، تەماشەکرنا ڤان دیمەنان بۆ وێ گەلەك ژ خوارنێ خوەشتر بوو.

گەلەك جاران سونێ چاڤێن خوە ددانانە سەر یەك و هزر دکر ئەو ژی ب ئازادی یا دناڤ باخچەی دا دهێت و دچیت، یان ژی یا دچیتە د هێلینا خوە دا و ل سەر هێکێن خوە دڕوونتە خوارێ داکو وان گەرم بکەت. هندەك جاران ژی وێ هزردکر ئەو یا دگەل دیکلی دناڤ بیستانی و کەسکاتیێ دا خوارنێ دخۆن یان ژی دچیتە دگەل وەردەکان و یاریان دکەت. لێ دەمێ وێ چاڤێن خوە ڤەدکرین و ژ وان خەونان هشیار دبووی، تووشی خەمگینی و پۆسیدەییەکا مەزن دبوو.

چ پێنەڤێت ئەڤ چەندە قەت چێنابیت و ب تنێ وەکی خەونەکێ یە، ئەڤە چەند ڕۆژە ئەو نەشێت چ هێکان بکەت. هەلبەت ئەڤ چەندە نە تشتەکێ سەیرە چونکی ب زۆری ئەو دشێت خوە ل سەر پێن خوە بگریت ڤێجا هەتا بشێت هێکان بکەت.

پشتی بۆ ڕۆژا پێنجێ ل سەر یەك وێ چ هێك نەکرین، سونێ ژ خەوەکا کوور ل دووڤ دەنگێ هەڤژینا جووتیاری هشیاربوو دەمێ ب دەنگەکێ بلند دگوتی: "دڤێت ئەم ڤێ مریشکێ سەرژێکەین، سوباهی دێ وێ ژ قەفەسکێ ئینینە دەرێ."

سونێ چ جاران باوەر نەدکر ئەو دێ ڕۆژەکێ ژ قەفەسکێ دەرکەڤیت، هەروەسا ئەو د ڕامانا پەیڤا "سەرژێکرن"ێ ژی نەدگەهشت، لێ

دەمێ وێ زانی ئەو دێ ژ قەفەسکێ دەرکەڤیت، ڤێ چەندێ هێز و شیان دانە وێ. وێ سەرێ خوە بلەز بلند کر و پاشی چەند فڕەك ل ئاڤێ دان.

ل ڕۆژا پاشتر ژی، ئەو نەشیا چ هێکان بکەت. سونێ هەست ب هندێ دکر کو لەشێ وێ نەشێت ئێدی چ هێکان دروست بکەت. لێ هێشتا ئەو یا برەکا کێم یا خوارنێ دخۆت و کێم ئاڤێ ژی ڤەدخۆت.

ئەو نەدشیا خوە ل هیڤیا هندێ بگریت کا ژیانا وێ یا نوو دێ کەنگی دەستپێکەت، تشتێ یەکانە یێ وێ دڤیا ئەو بوو ل سەر هێکێن خوە ب ڕوونتە خوارێ و بکەتە چیچەلۆك. ئەو هینگێ دا شێت ڤێ چەندێ کەت هەکە ئەو شیابا ژ قەفەسکێ دەرکەڤیت. سونێ ب کەیف و جۆشەکا مەزن ڤە چاڤەڕیێ دەرکەڤتنا خوە بۆ ژ قەفەسکێ. وێ شەڤێ هەموویێ ئەو یا هشیاربوو و هزرا خوە د هندێ دا دکر ئەو یا دگەل دیکلی دناڤ باخچەی دا دگەڕییێت و خوارنێ دخۆت.

ل ڕۆژا پاشتر دەرگەهێ قەفەسکێ هاتە ڤەکرن و جووتیار و هەڤژینا خوە هاتنە د ژوور ڤە و عەرەبانەیەکا ڤالا پالدا د ژوور ڤە. سونێ هند یا نەخوەش بوو تا وی ڕادەی نەدشیا ڕاست ڕابیتەڤە، لێ ژ لایێ هزری ڤە ئەو ژ بەری نوکە گەلەك پەیت و هشیارتر بوو. وێ بۆ یەکەم جار د ژیانا خوە دا دەنگێ خوە بلند کر و گوت: "ئەز دێ ژ قەفەسکێ دەرکەڤم!".

هەر ژ وێ ڕۆژا ئەو دناڤ ڤێ قەفەسکێ دا هاتیە زیندانکرن، ئەڤرۆکە خوەشترین ڕۆژە د ژیانا وێ دا. ل ڤی دەمی دارا خەرنوڤێ بێهنا گولێن خوە یێن خوەش ل وان دەوروبەران بەلاڤکر بوو.

هەڤژینا جووتیاری پرسیار ژ زەلامێ خوە کر: "ڕەنگە ئەم بشێین هندەك پارەی بەرامبەر گوشتێ وێ ب دەستخوەڤە بینین، مانە هۆسایە؟"

زەلامێ وێ گوت: "ئەز باوەرناکەم، چونکی هۆسا دیارە ئەو یا نەخوەشە."

ڤێ گەنگەشەیێ ب چ ڕەنگان سەرنجا سونێ نەڕاکێشا و کارتێکرن ل ووڕەیێن وێ نەکر چونکی ل وی دەمی دلێ وێ گەلەك یێ ب کەیف بوو و وێ هزر دکر ل دوماهیێ ئەو دێ شێت خێزانەکێ دناڤ باخچەی دا بۆ خوە دروست بکەت.

جووتیاری دەستێ خوە هاڤێتە پەڕەکێ وێ و ژ قەفەسکێ ئینا دەرێ هاڤێتە دناڤ وێ عەرەبانکا ڤالا دا، ل دەمێ هاڤێتنێ خوە کرێن ژ لەشێ وێ هات. ئەو هند یا نەخوەش بوو تا وی ڕادەی نەدشیا بەرەڤانیێ ژ خوە بکەت یان پەڕێن خوە ڤەکەت. وێ ب تنێ شیا بۆ ماوەیێ چرکەیەکێ سەرێ خوە بلند بکەت لێ زێدەتر نەشیا چ دی بکەت.

ل دووڤ دا جووتیاری مریشکێن دی یێن نەخوەش هاڤێتنە د عەرەبانێ دا و هەموو کەڤتنە سەر کەلەخێ وێ و پیچەك مابوو وێ بفەتسینن.

ژ لایەکێ دی ڤە، جووتیاری و هەڤژینا خوە ئەو مریشکێن دی یێن چەندین سالە هێك دکرین، هەرچەندە نوکە وان شیانێن کرنا هێکان نینن لێ هێشتا ساخلەمیا وان یا باشە، کرنە دناڤ قەفەسکەکا دی دا و جودا ئەو دانانە ڕەخەکی و کرنە د لوریەکێ دا داکو وان بەرەڤ بازاڕی ڤە ببەن و بفرۆشن.

سونیٚ مابوو دناڤ عەرەبانکیٚ دا و کەڤتبوو بن هندەك مریشکێن دی یێن نەخوەش و پیچ پیچە ڕەوشا وێ بەرەڤ نەباشیێ دچوو و نێزیکی مرنیٚ دبوو.

پشتی جووتیاری دوماهیك مریشك هاڤێتیە دناڤ عەرەبانکیٚ دا، ئەو مریشك کەڤتە سەر سەرێ سونیٚ و گەلەك ترساند. وێ بزاڤ دکر ب هەر ڕەنگەکیٚ هەبیت بمینتە هشیار داکو بزانیت کا دێ چ ڕوودەت. هێدی هێدی مریشکێن نەساخ گیانیٚ خوە ژ دەست ددان و هەموو مرن، پشتی بێهنەکیٚ وێ گوهـ ل چ دەنگان نەبوو دگەل هندێ ژی ئێدی بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو بێهنا خوە بهەلکێشیت.

وێ د دلیٚ خوە دا گوت: "ئەرێ تو بێژی ئەڤ چەندا ڕووددەت ڕامانا وێ ئەوە دێ مە سەرژێکەن؟"

سونیٚ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك و پاشی گوت: " نەخێر، نابیت ئەز ب ڤی ڕەنگی بمرم."

وێ بزاڤ کر هەموو چاڤنەترسی و ئازایەتیا خوە کۆم بکەت لیٚ هەموو زەحمەتا وێ د بەر ئاڤیٚ دا چوو. ئەو ژ نیڤا دلیٚ خوە یا خەمگین بوو، چونکی ئەو دترسیا بمریت و نەگەهیت بچیتە دناڤ باخچەی دا و مرادا خوە بجهبینیت.

پێدڤیە ئەو ژناڤ عەرەبانیٚ دا بهێتە دەرێ و برەڤیت، لیٚ ئەو دناڤ مریشکان دا بەرزە ببوو و نەدشیا خوە لڤینەکیٚ ژی بکەت، هەروەسا ئەو مریشکێن کەڤتینە سەر لەشیٚ وێ ژی هەستیکێن لەشیٚ وێ هەموو هەڕشاند بوون.

سونێ تەماشەی دارا خەرنوّڤێ دکر کا چەوا یا دناڤ گولێن جوان و بەلگێن کەسك و بێهنەکا خوەش دا نقوومبووی، هەروەسا وێ تەماشەی گیانەوەران دکر کا چەند د کەیفخوەشن دناڤ باخچەی دا.

سونێ ب تنێ یەك هیڤی هەبوو، ئەو ژی ل سەر هێکەکێ بڕوونتە خوارێ و خوە ل هیڤیا وێ بگریت هەتا چیچەلوّکا وێ ژ دایك دبیت. هەلبەت ئەڤ چەندە ژی خەونەکا ئاسایی یە و نە یا ب زەحمەتە، لێ نوکە ئەو هێدی هێدی یا دمریت بەری کو بشێت ڤێ خەونا خوە بجه بینیت.

دەمێ هێدی هێدی ئەو بەرەڤ هندێ ڤە دچوو هشێن خوە ژ دەست بدەت، ئێدی هندەك تشتێن نەئاسایی دهاتنە پێش چاڤێن وێ، وێ دیت ئەو یا ل سەر هێکەکێ ڕوونشتیە خوارێ و یا هێلینا خوە گەرم دکەت. هەروەسا دیکل ژی ژ دەرڤە یێ زێرەڤانییێ لێ دکەت و دارا خەرنوّڤێ ژی وەکی بەفرێ یا گولێن خوە ب سەر وێ دا دبارینیت.

وێ ژبەر خوە دگوت: "هەموو گاڤان مرادا من ئەو بوو ب تنێ ئەز ل سەر هێکەکێ کورك ببم، ب تنێ هێکەکێ! ب تنێ بلا هێکەك بوّ من بیت دا ل سەر کورك ببم و بچمە بن گوهێ وێ و بێژمێ "خوەشتڤیا من، ئەز چ جاران تە ناهێلم. دێ لەزێ بکە، ئەو قەلپێ ل دورماندوری خوە بشکێنە چونکی من دڤێت تە ببینم، خوەشتڤیا من نەترسە! دەمێ تو دهێیە ژ دەرڤە دێ تە هەمبێز کەم."

سونێ هزردکر ژ ڕاست دەمە دێ هێکا وێ شکێت و چیچەلوّکەك ژێ دەرکەڤیت، ل دووڤ دا ب دێمەکێ پڕی گرنژین و بێگونەهی، ئەو ژ هشێن خوە چوو.

سونێ چاڤێن خوه ڤەکرن، تو بێژی ئەڤە چەند دەم چوو بیت دەمێ ئەو ژ هش چووی؟ نوکە باران یا دباریت و لەشێ وێ هەموو یێ تەڕ بووی. ئەو نزانیت کا نوکە ئەو ل کیڤەیە.

وێ گوت: "ئەز دبێژم هێشتا ئەز نەمریمە."

نوکە ئەو ژ سەرما دا یا دلەزریت، هەتا پشتی ئەو هاتیە سەر هشێن خوە ژی، هێشتا ئەو نەشێت خوە بلڤینیت. دا ئەو یا باشتر بیت هەکە وێ پەڕێن خوە ڤەکربان، لێ نوکە وێ هند هێز نینە ڤێ چەندێ ژی بکەت.

ژ نیشکەکێ ڤە وێ ژ لایێ سەری ڤە گوهـ ل دەنگەکی بوو، پشتی ئەو دەنگ چەند جارەکان دووبارە بووی ژ نوو ئەو تێگەهشت کا چ دبێژیت.

وی دەنگی دگوت :"هێی تو، تە گوهـ ل من هەیە؟"

سونێ سەرێ خوە بلند کر، بێهنەکا گەلەك پیس هاتە دفنا وێ، لێ وێ نەزانی کا ئەو چ تشتە ل دورماندوری وێ.

دووبارە وی دەنگێ گوتێ: "تو یا ب سلامەتی، ئەز دزانم تو یا ب سلامەتی و نەمریە!"

پاشی ئەو دەنگ بلندتر لێ هات و گوتێ: "زوو ڕابەڤە، ژ جهێ خوە ڕابە!"

سونێ گوت: "ڕابمەڤە؟ ئەز نەشێم خوە ژ جهێ خوە بلڤم چونکی ئەز یا ئاسێ بوویم."

سونێ تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر، دارەکا بلند دناڤ تارپاتییێ یا دیاربوو، هەروەسا گیای ژی ل بەر پێلێن بایی سەما دکر. جارەکا دی ژی ل جهەکی هەمان دەنگ هاتە گوهێن وێ :"تو نەمریە، راببەڤە، دێ لەزێ بکە."

سونێ گوت: " چ پێنەڤێت ئەز نەمریمە."

پاشی وێ پەرێن خوە ڤەکرن و پێن خوە کێشانە بەر خوە و خوە بەرەڤ ڤی لایی و لایێ دی دلڤاند، هەموو تشت بۆ وێ د ئاسایی و خراپ نەبوون ب تنێ ئەو نەبیت پیچەکێ ئەو یا وەستیایی و بێهێز بووی.

سونێ پرسیار کر: "بێژە من تو کی و تە چ دڤێت؟"

وی دەنگی بەرسڤا وێ دا: "جارێ پرسیاران نەکە، ب تنێ نوکە یا ل سەر تە پێدڤی ئەوە تو بلەز بکەیە غار و برەڤی، لەزێ بکە!"

سونێ ب شێوەیەکێ خوار رابوو سەر پێن خوە و وێ هەموو بزاڤێن خوە بکارئینان هەتا بشێت چەند پێنگاڤەکان بەرەڤ وی دەنگی ڤە بچیت. پشتی وێ چەند پێنگاڤ هاڤێتین، جارەکا دی ئەو د جهێ خوە دا رەق بوو و روونشتە خوارێ و نەشیا برێڤە بچیت، وێ گوت: "ئای خودێ ئەڤە چیە؟ بۆچی ئەز نەشێم برێڤە بچم؟"

ل دورماندوری وێ هژمارەکا مەزن یا مریکشێن مری هەبوو و وێ ژی تەماشەی وان دکر، وێ دیت ئەو یا ل سەر گورەکێ مریشکان روونشتیە.

سونێ گوت: "بەلێ هێشتا ئەز یا ساخم، ئەز ل ڤێرێ چ دکەم؟"

پاشی ئەو ڕابووڤە و کرە غار لێ هەر نەدشیا خوە ڕزگار بکەت. هەر پێنگاڤەکا وێ دهاڤێت، پێ وێ دکەڤتە دناڤ کۆمەکا لەشێن مریشکێن مری دا. وێ هەست ب ترسەکا مەزن دکر و قەت باوەر ژ چاڤێن خوە نەدکر کو یا دیمەنەکێ هۆسا دبینیت.

وی دەنگی پرسیار ژێ کرەڤە: "تو دناڤ ڤێ گۆڕستانا مریشکان دا چ دکەی؟"

لێ سونێ یا مژوولی ڕەڤینێ و غاردانێ بوو لەوڕا هند ئاگەهـ ژ وی دەنگی نەبوو.

- "ئۆهـ نە! ئەڤە ئەز چ دکەم؟"
- باش بەرێ خوە بدە بەر سینگێ خوە و بلا تە ئاگەهـ ژ خوە هەبیت."
- "ئەز نە یا مریمە، چەوا ئەز هاتیمە ڤێرێ؟"
- "تەماشەی ڤێرێ بکە دەمە تو دێ بیە نێچیرا گیانەوەرەکی."
- "ئەرێ ئەز چ دکەم؟ ئەرێ ئەز چ دکەم؟
- "بلەز بکە غار! ئەرێ ما تو نابینی تو دێ بیە نێچیرا گیانەوەرەکێ دی، تو مریشکەکا لاڵی! چاڤێ گیانەوەرەکێ دڕندە ڕك و ڕك یێ ل تە!"

ل وی دەمی سونێ ب ترس ڤە د جهێ خوە دا ڕاوەستیا و تەماشەی پشت خوە کر. بەروڤاژی ئاراستەیێ وی دەنگێ بەری نوکە دگەل وێ دئاخفتی، دەنگێ خش خشا گیانەوەرەکی دناڤ گیای دا دهاتە گوهێن وێ.

وێ هند دیت دوو چاڤێن زیق دیاربوون و بەرێ وان یێ ل وێ، تەزینکەك ب سەر لەشێ وێ دا هات.

وی دەنگی گوتێ: "ئەگەر تو بمینیە ل وی جهی، تو دێ خوە تووشی ئاریشەیەکێ کەی!"

سونێ نەدزانی کا ئەو کیە ژ دەرڤەی وێ گۆڕستانا مریشکێن مری شیرەتان ل وێ دکەت، لێ وێ دزانی خوەدانێ وی دەنگی پتر جهێ باوەریێ یە ژ خوەدانێ وان چاڤێن دناڤ گیای دا زیق دکەن.

وی دەنگی کرە هەوار:"پێدڤیە تو وەکی دیکلەکی سەرەدەریێ بکەی چونکی ب تنێ وی وێرەکیەکا هۆسا یا هەی بشێت دناڤ ڤێ تارڕیاتیێ دا بانگ بدەت!"

سونێ ل دووڤ ئاراستەیێ وی دەنگی چوو و هەتا گەهشتیە کوژیەکێ وێ چالێ کو هند یێ ڕك و دژوار نەبوو ژبەر هندێ ئەو شیا ب سانەهی ژێ دەرکەڤیت.

ب دەنگەکێ نەرم و ئارام ڤە هەڤالێ وێ یێ نوو گوتێ: "تە کارەکێ باش کر."

سونێ پیچەك لەرزی و پاشی باش تەماشەی هەڤالێ خوە یێ نوو کر. هەڤالێ وێ یێ نوو وەردەکەکێ کووڤی بوو دناڤ باخچەی دا دگەل وەردەکێن کەهی دژیا. هەلبەت ئەڤە ئەو وەردەکێ کووڤی یێ یەکانە بوو یێ پەڕێن وێ د کەسك و قەهوایی، ئەو وەردەکەکێ ب تنێ بوو یێ کو هەموو گاڤان ل دوماهیا وەردەکێن دی دچوو.

نوکە سونێ ژ نوو باوەرکر کو ب ڕاستی ئەو یا ژ قەفەسکا مریشکان قورتالبووی.

سونێ گوتە هەڤالێ خوە: "ئەز سوپاسیا تە دکەم کو تە ئەز قورتال کریم."

– "پێدڤی ناکەت تو سوپاسیا من بکەی، ب تنێ من نەهێلایە ئەو تە بخۆت. دەمێ ئەو گیانەوەرەکێ ساخ دخۆت، ئەز گەلەك تۆڕە دبم."
– "کی؟"
– "کووشك"[1]

وەردەك ل جهێ خوە لەرزی، پەڕێن حەفکا وێ هەموو ڕەق ڕاوەستیان دەمێ وی ناڤێ کووشکی ئینایی. سونێ ژی ژ ترسا دا لەرزی، کووشك ب شانازی ڤە ل لایێ دی یێ چالێ ڕاوەستیابوو، وی ب ناڤ چاڤ گرێ ڤە تەماشەی وان دکر و گەلەك یێ تۆڕەبوو چونکی ئەڤ جارە خوارنا وی ژ دەستێن وی چوو.

وەردەکی گوت: "نوکە پشتی تو قورتالبووی، بزڤڕە مالا خوە" پاشی هێدی هێدی ئەو ژ وێرێ دوور کەڤت.

– "کا ڕاوەستێ، دێ کیڤە چی؟"

وەردەکی ل بەر نەبوو وێ دگەل خوە ببەتە مال. لێ سونێ دڤیا دگەل وی بچیتە دناڤ باخچەی دا. ئەرێ تو بێژی بۆچی نوکە ئەو دێ زڤڕیتە مال؟

[1] (کویشك، مشکخۆر، گولەبووك، جەنباز، ابن عرس، Weasel)

- " من نەڤێت جارەکا دی بچمە دناڤ قەفەسکێ دا، ب زۆری ئەز یا ژ وێرێ دەرکەڤتیم، ئەز ژ سەرژێکرنێ یا قورتالبوویم."
- "سەرژێکرن؟ مەرەما تە ژ ڤێ گوتنێ چیە؟"
- "هەر چەندە ئەز نە یا پشتڕاستم کا ڕامانا وێ چیە، لێ ئەز دبێژم ڕامانا وێ ئەوە کو ئەز یا ئازادم."
- "هەر چەوابیت بۆ تە جهێ مەترسیێ یە تو نوکە بمینیە ل ڤێرێ، ژ ڤێرێ هەڕە. ئەز یێ بلەزم و دڤێت زوو بڤەگەڕمە مال چونکی نوکە هەموو گیانەوەر چووینە سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ."

وەردەکێ کووڤی گەلەك یێ وەستیایی بوو، وی بەرێ خوە دا ڕێکا مال و چوو. سونێ تەماشەی کووشکی کر، پاشی بلەز کرە غار هەتا گەهشتیە وەردەکی و پرسیار ژێ کر:

"ئەرێ تە چەوا زانی ئەز یا دناڤ وی گوڕێ مریشکان دا؟"

وەردەکی بەرسڤا وێ دا: "دەمێ ئەز ژ سەر برکا ئاڤێ ڤەگەڕیایمە مال، من دیت کووشك یێ چاڤێن خوە دگێڕینیت و تەماشەی تشتەکی دکەت، ڕامانا ڤێ چەندێ ئەو بوو کو هێشتا مریشکەکا ساخ یا مایە دناڤ گوڕی دا، ئەز وی گیانەوەرێ دڕندە و مەترسیدار باش دنیاسم!"

جارەکا دی وەردەکی خوە لەرزاند و موویێن حەفکا وی جارەکا دی ڕەق ڕاوەستیان، پاشی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت:

"ئەو گیانەوەرەکە بەردەوام ل دووڤ نێچیرین زیندی دگەڕیت، هەروەسا ئەو هند یێ مەزنە تا وی ڕادەی قەبارەیێ وی ژ هەموو نیچیرێن وی مەزنترە ب تایبەت مریشکان. ئەو نێچیرێن خوە ب ساخی دگریت داکو

بۆ وان دیار بکەت تا چ ڕادە ئەو یێ بهێزە. مریشکەکا ساخ یا وەك تە نێچیرەکا هەرەباشە بۆ وی. ئەو تشتێ ئەڤرۆکە ڕوودایی ئەو هەموو ڕۆژان دووبارە دکەت و نێچیرێن خوە ل وێرێ دگریت، لێ ب ڕاستی تو مریشکەکا ب بەختبووی."

سونێ گوت: "ئەڤ چەندە ڕاستە، ئەز یا ب بەختبووم لێ ئەڤ چەندە هەموو بۆ تە ڤەدگەڕیت و ئەز سوپاسیا تە دکەم."

سونێ ب دووڤ وەردەکی کەڤت و دەمێ بیرا وێ هاتی کو ئەو دا بیتە نێچیرەکا باش بۆ کووشکی، موویێن وێ قژ دبوون ژ ترسان دا.

وەردەکی گوت: "من چ جاران مریشکێن وەکی تە نەدیتینە. باشبوو تو شیایی خوە قورتال بکەی. نوکە کووشك مەندەهۆش مایە کا چەوا وی نێچیرەکا وەکی تە یا شەمبۆز ژ دەستێن خوە کریە."

پاشی وێ کرە کەنی و ل دور خوە زڤڕی و تەماشەی گۆڕێ مریشکان کر. هێشتا کووشك ل وێرێ مابوو و ب تۆڕەیی ڤە تەماشەی وان دکر. سونێ هەر یەکسەر ژ ترسان دا چاڤێن خوە گرتن، لێ وەردەك یێ ئارام و ژ خوە پشتڕاستبوو.

– "ئەز یێ پشتڕاستم جارەکا دی تو دێ وی بینیەڤە چونکی ئەو گیانەوەرە چ جاران دەستان ناداهێلیت.

– " ژ ڕاست؟"

– ئەز دبێژم تو یەکەم مریشکی ب ساخی ژ وێ گۆڕستانێ دەردکەڤی."

– "بەلێ ئەز هێشتا نەمری بووم."

وەردەك يێ بەردەوام بوو ل سەر رێڤەچوونا خوە هەتا ئەو گەهشتینە بن دارا خەرنۆفێ. پاشی پرسیار ژ مریشكێ كر: "نوكە تو دێ كیڤە چی؟"

سونێ ب دوو دلی ڤە گوت: "ئەز ژی نزانم، لێ من هندی سەرێ دەرزیكێ حەز نینە جارەكا دی ب ڤەگەرمە د قەفەسكێ دا."

— "تە بەری نوكە ژی ئەڤ چەندە گوتبوو."

— "راستە، من وەگوتبوو و ئەز داخوازا لێبورینێ ژ تە دكەم، ئەرێ تو من دگەل خوە نابەی؟"

— "بۆ كیڤە؟ بۆ ناڤ باخچەی؟" وەردەكی سەرێ خوە ئینا و بر و چ بەرسڤ نەدانە سونێ.

سونێ ئەو ئێخستە دناڤ هەلویستەكێ تەنگاڤ دا. هەرچەندە وی هەست ب نەئارامیەكا مەزن كر ژبەر ڤێ داخوازا وێ، لێ دگەل هندێ ژی دل نەدا ب ئاوایەكێ راستەوخۆ داخوازا وێ رەت بكەت. پاشی گوت:

"ئەز نە گیانەوەرێ ڤێ مالێ مە، لێ تو مریشكی و جهێ تە ڤێرێ یە، ژبەر هندێ رەنگە ...." پاشی وەردەكی ئەو دگەل خوە برە د باخچەی دا كو ل وی دەمی گیانەوەر هەموو د نڤستی بوون.

سەیێ پیر ل سەر پشتا خوە ل بەر دەرێ خانیکێ خوە یێ بچووك یێ درێژ کری بوو ب تنێ کوری و پاشییا وی نەبیت د ژوور ڤە بوون. ل وی دەمی، هێشتا باش مژوولانکێن چاڤێن وی نەکەڤتبوونە سەر یەك لێ پیچەك مابوو ب تەمامی بچیتە د خەوەکا کوور دا. ژ نیشکەکێ ڤە دەمێ چاڤێن وی ب وەردەکێ کووڤی کەڤتین کو مریشکەکا هەموو پەڕێن وێ یێن سەر ملا ژێ وەریایی و تەڕ یا دگەل، هەر یەکسەر ژ جهێ خوە ڕابووڤە.

سەیێ پیر گوت: " ئەڤە چ بێهنا پیسە ژ ڤێ مریشکێ دهێت؟"

پاشی ئەو سە نێزیکی وان بوو، لێ سونێ ژ ترسان دا خوە دا پشت وەردەکی.

داکو سەیێ پیر تۆڕە نەبیت، وەردەکی ب دەنگەکێ نەرم ڤە گوتێ: "زیانێ نەگەهینە وێ، ئەو مریشکەکا بەلنگازە و نە زێدەتر."

لێ سەیێ پیر خوە تەحل و ترش کر و ل دورماندوری سونێ دزڤڕی، هەروەکی وی ل دەلیڤەیەکێ دگەڕیا داکو وێ بگریت. پاشی وی ددانێن خوە یێن تیژ ئینانە دەرێ و ب تۆڕەیی ڤە گوت: "ئەز ڕێکێ نادەم هەر کەسێ بهێتە ڤێرە ب دلێ خوە بهێتە د ژوور ڤە، ئەرێ ئەز وەك زێرەڤان پا کارێ من ل ڤێرێ چیە؟"

ئەو قەرەبالغا ل بەر دەرگەهی پەیدابووی بوو ئەگەر وەردەکێن دی هەموو ژ خەو هشیار بن و پاشی یەك یەکە هاتنە بەر دەرگەهی. وەردەکەکی ب گازندە ڤە گوت: "ئەڤە چیە؟ هێشتا ئەو یێ ل ڤێرێ و جارەکا دی زڤڕی ڤە بۆ ناڤ باخچەی".

هەموو وەردەکان ب ڤێژی ڤە گوت: "ڤێجا سەحکێ ئەڤ جارە وی کی یا دایە دووڤ خوە؟".

پاشی وەردەکەکا دی ژی ب کەنی ڤە گوت: "سەحکەنێ ئەو چەند یێ بێچارەیە؟ ڤێجا ژ نوو مریشکەك ژی یا دایە دووڤ خوە، مریشکەکا ڕەپ و ڕووت، هۆسا دیارە ئەو یا ژ دەڤێ کووشکی قورتالبووی."

هەرچەندە وەردەکێ کووڤی چ پیتە ب ئاخفتنێن وان نەدکر و یێ بێدەنگ بوو، لێ سونێ دیت ئەو یێ ژ سەرما دا دلەرزیت و پەڕێن حەفکا وی یێن بلند و ڕەقبووین. سونێ ژبەر وی ب خەم کەڤت چونکی ئەو بوو ئەگەر هەڤالێن وی تڕانەیان پێ بکەن.

پاشی وەردەکەکا دی گوت: "هێی تو وەردەکێ سەربەردای، دەمێ تو ژ ڤێرێ چووی کەیفا مە هات چونکی جهەکێ ڤالا بۆ مە ما، لێ ئەڤ جارە نە ب تنێ تو زڤڕی بەلکو تە مریشکەکا نەساخ ژی یا دگەل خوە ئینای."

وەردەکەکا دی گوت: "هەر نوکە وێ ژ ڤێرێ بکەنە دەرێ نەکو نەخوەشیا وێ مە هەموویان تووش بکەت."

وەردەك هەموو ل سەر هندێ ڕێکەڤتن کو دڤێت هەر نوکە ئەو مریشکێ ژ وێرێ بکەنە دەرێ و دڤێت ب زووترین دەم ژ وی جهی دوور بکەڤیت ژی داکو ئەو تووشی نەساخیا وێ نەبن. ئەڤ چەندە یا ب دلێ سەیێ پیر ژی بوو، لەوڕا ب دلەکێ پڕی کەیف ڤە تەماشەی سونێ کر و لێ ڕەوی و گوتێ: "باشە تە ب خوە گوهـ ل ئاخفتنێن وان بوو! ڤێجا ئێدی ڤەت هزرنەکە تو بۆ خوە جهەکی ل ڤێرێ ببینی."

سونێ ژ ترسان دا سەرێ خوە چەماند، لێ ئەوێ نەدزانی ل ڤێ نیڤا شەڤێ دێ کیڤە چیت، ژبەر هندێ ئەو ل نێزیکی کۆلکێ وەردەکان ما و خوە درێژ کر و ب خەم ڤە گوت: "ئەز نە مریشکەکا نەساخ و ئێش ڤەگرم، من نەڤێت ئەز زیانێ و نەخوەشیێ بگەهینمە کەسێ ژی."

سونێ هزر دکر هەر دەمێ ئەو ژ قەفەسکا خوە بدەرکەڤیت، هەموو گیانەوەرێن ناڤ باخچەی دێ پێشوازیا وێ کەن و بنە هەڤالێن وێ، لێ ئەو پێشبینییا وێ ڕاست نەدەرکەڤت. وێ گوت: "هیڤییا من ئەو بوو ئەز ژیانا خوە یا مایی دناڤ باخچەی دا ببورینم."

سەیێ پیر لێ زڤڕی و گوتێ: "چەوا؟ ئەڤ چەندە چێنابیت، چونکی تو مریشکەکا هێککەری و دڤێت ژیانا خوە دناڤ قەفەسکێ دا ببورینی نەك د کۆلکی ڤە."

ئەزمانێ سونێ گران ببوو و ب زۆری پەیڤ ژ دەڤێ وێ ددەرکەڤتن: "بەلێ من دڤێت ئەز ئێدی ژ دەرڤەی قەفەسکێ بژیم، من نەڤێت هەتا هەتا دناڤ وێ زیندانێ دا بم."

سونێ بزاڤ دکرن وەردەکێن ناڤ باخچەی ڕازی بکەت وێ ژ ناڤ باخچەی نەدەرێخن، لێ گاڤ بۆ گاڤێ سەیێ پیر هارتر لێ دهات، هەتا ل دوماهیێ وی پالەکا بهێز ل سونێ دا و ئەو دناڤ ئاخێ دا گەڤزاند و چەندین جاران سونێ بزاڤ کر ڕابیتەڤە لێ سەیی دووبارە پالێ ل وێ ددان. وەردەکان ب ڤی دیمەنی دکرە کەنی و یاری بۆ خوە ب سونێ دکرن، ژبەر ڤێ چەندێ دلێ وێ تژی خەم و نەخوەشی بوون و چاڤێن وێ ژ ڕۆندکان پڕبوون.

ژ نیشکەکێ ڤە وەردەکێ کووڤی ب تۆڕەیی ڤە ل هەموو گیانەوەرێن دی کرە هەوار و گوتێ: "ئاخ بۆ ترسنۆکی و دلڕەقیا هەوە! بۆچی هوون بەلاٚ خوە ژ وێ مریشکا بەلنگاز ڤەناکەن. ئەز هاتم دا پرسیارێ ژ هەوە بکەم کا هوون دێ شێن هاریکاریا وێ کەن یان نە، لێ ڕەفتارێن هەوە جهێ شەرمزارییێ نە و هوون گەلەك د دلڕەقن."

وەردەکەکێ دبن لێڤکان ڤە گوت: "تو دبێژیە مە دلێ هەوە یێ ڕەقە، باشە ژبیرا تە چوویە کو مە ب زۆری هێلایە تو بهێیە دناڤ باخچەی دا و دگەل مە بژی."

وەردەکێ کووڤی دەمێ گوهـ ل ڤان ئاخفتنان بووی، زێدەتر نەشیا ل سەر خوە زالٚ ببیت و ب دەنگەکێ بلند و تۆڕەڤە گوت: "ئەو مریشکا بەخت ڕەش یا ژ چالاٚ مرنێ ڤەگەڕیایی، هەتا نوکە خوە مریشکەك ژ وێرێ نەڤەگەڕیایە، کووشکی خوە بەرهەڤ دکر داکو وێ بخۆت، لێ ئەو گەلەك یا ب جەرگ و چاڤنەترس بوو و شیا خوە ژ دەستێن وی ڕزگار بکەت."

وەردەك هەموو مەندەهۆش مان دەمێ وان گوهـ ل ڤێ ڕاستیێ بووی. وەردەکێ کووڤی دیسان گوت: "ئەو بەرامبەر کووشکی ڕاوەستیا و بەرەڤانی ژ خوە کر. باشە کا بێژنە من کێ ژ هەوە ئەو وێرەکی هەیە کارەکێ هۆسا بکەت؟ ئەز یێ پشتڕاستم هەر یەك ژ هەوە ئەگەر وەکی وێ کەڤتبایە بەر دەستێن کووشکی، نوکە خوە پەرێن وێ ژی نەمابانە."

وەردەکێن باخچەی هەموو ژ بەر تۆڕەییا وەردەکێ کووڤی و بەرەڤانیکرنا وی ژ سونێ بێدەنگ بوون و کەس نەوێریا پەیڤەکا ب تنێ

ژی باخڤیت. سەیێ پیر ژی دناڤ وەردەکان دا یێ ڕاوەستیایی بوو و چاڤێن خوە شۆر کربوون و نەدوێریا بڕەویت.

پاشی وەردەکێ کووڤی پێشنیارەك کر و گوت: "ئەم دشێن د کوژیەکێ بچووك یێ ڤی کۆلکی دا جهەکی بدەینێ داکو ئەو ژی ب ئازادی دناڤ مە دا بژیت و ئێدی پێدڤی ب نەڕازیبوون و ڤێژ ڤێژا هەوە ناکەت."

نوکە سونێ ژبەر وێرەکی و چاڤنەترسیا وەردەکێ کووڤی یا مەندەهۆش مای، چونکی بەری نوکە هندی وێ دیتی دەمێ وەردەك دچوونە جهەکی ئەو ل دوماهیا هەموویان بوو، هەموو گاڤان ژی وەکی وەردەکەکێ بچووك و بەلنگاز دهاتە پێش چاڤێن وێ.

وەردەکەکێ بەرێ خوە دا وەردەکێ کووڤی و گوتێ: "دەڤێ خوە بگرە، ئەڤە نە شۆلا تەیە." پاشی مەزنێ وەردەکان هاتە پێش و گوت: "تو وەردەکەکێ بیانی، چەوا تو هۆسا ل بەرامبەری مە د ڕاوەستی و خوە ژ مە تۆڕە دکەی؟ بلا ژبیرا تە نەچیت هەر ئەم بووین یێن کو دەلیڤە دایە تە بهێیە دناڤ باخچەی دا و دگەل مە بژی، ژبەر هندێ دڤێت تو سوپاسدارێ مە بی!"

پشتی هینگێ دیکل ژبەر ڤەرەبالغا وان هشیاربوو و هاتە ژ دەرڤە، دیکلی گوت: "ئەز مەزنێ ڤی باخچەی مە و کەسێ ماف نینە ژبلی من بڕیاران بدەت، هێی تو وەردەکێ کووڤی، چێنابیت تو مایێ خوە د چ تشتان بکەی."

هەموو گیانەوەرێن ناڤ باخچەی ب چاڤەکێ مەزن تەماشەی دیکلی دکر. دەمێ ئەو دئاخفت هەموویان خوە بێدەنگ دکر و ب ڕێزڤە گوهێ

خوه ددا ئاخفتنێن وی. دەنگێ دیکلی هەروەکی کا چەوا سپێدەهیان یێ بهێز و کاریگەر بوو، ئاها نوکە ژی یێ بهێز و بلند بوو.

پاشی دیکلی بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "ئەز ڕێکێ نادەم کەس قەرەبالغێ ل ڤێرێ بکەت، نوکە درەنگی شەڤە و دوور نینە جارەکا دی کووشکی خوە ل جهەکێ نێزیك ڤەشارت بیت و چاڤەڕێێ نێچیرەکێ بیت. ئەڤ مریشکە دشێت بۆ شەڤەکێ دناڤ باخچەی دا بمینیت، لێ چونکی نوکە دەرگەهێن هەموو قەفەسکان دگرتینە، ئەم دێ دەلیڤەیێ دەینێ ئەڤ شەڤە ئەو دناڤ کونجەکا کۆلکی ڤە بنڤیت، لێ هەردەمێ بوو سپێدە و من بانگ دا و ڕۆژ هەلات دڤێت ئەو دەرکەڤیتە ژ دەرڤە و ژ ڤێرە دوور بکەڤیت."

پشتی دیکلی بڕیارا خوە دایی، چوو سەر جهێن خوە و ڕوونشتە خوارێ. پاشی مەزنێ وەردەکان ژی دا ب دووڤ وی ڤە و وەردەکێن دی ژی هەموو دگەل چوونە سەر جهێن خوە. ل دووڤ دا وەردەکێ کووڤی ژی پشتی وەستیانەکا درێژ چوو سەر جهێن خوە و سونێ ل دوماهیا هەموویان چوو د ژوور ڤە. سەیێ پیر ژی ب چاڤێن نیڤ خەوڤە دناڤ گۆرەپانا باخچەی دا دەست ب زێرەڤانیێ کر.

ژیانا دناڤ کۆلکی دا گەلەك یا خوەش بوو، لەگەنەکا مەزن یا ئاڤێ ل ڕەخەکێ وێ یێ دانایی بوو و ل چەندین ڕەخێن دی ژی خوارنەکا بەرفرەه هەبوو.  هەروەسا ل جهەکێ بلند قەفتێن مەزن یێن گیای و پیشی ل سەر یەك د دانایی بوون.

ل ڤێرێ سونێ هەست ب ژیانەکا نوو کر کو گەلەك یا جودا بوو ژ ژیانا وێ ئەوا دناڤ قەفەسکێ دا دبوراندی. نوکە ئەو دشێت ب نیڤا دلێ

خوە پەڕێن خوە ڤەکەت، هەروەسا چ سیمەیێن تێلەیی ژی ل بەر سینگێ وێ نینن ڕێگریێ ل هاتنوچوونا وێ بکەت.

ل جهەکێ بلند دناڤ کۆلکی دا، دیکل و مریشکا هەڤالا خوە ل سەر جهێ خوە د ڕازایی بوون و تەماشەی گیانەوەرێن ل بن خوە دا دکرن. وەردەك هەموو ل جهەکی خڕڤە ببوون و سەرێن خوە پێکڤە نابوون. وەردەکێ کووڤی ژی دوور ژ هەموویان و ل جهەکێ نێزیکی بەر دەرگەهی ڕوونشتبوو کو هۆسا دیاربوو ئەو جهێ وێ یێ تایبەت بوو.

سونێ دزانی پێدڤیە ئەو ل جهەکێ هۆسا بڕوونتە خوارێ کو ژ هەموویان یێ دوور بیت. ژبەر هندێ خوە نێزیکی بەر دەرگەهی کر و چاڵەکا ئاخێ یا بچووك کۆلا و تێدا ڕوونشتە خوارێ و سەرێ خوە کرە دناڤ پەڕێن خوە دا. ئەو د خەونێ ژی دا نەدوێریا هزرا خوە د هندێ دا بکەت کو یا دناڤ هێلینەکا گەرم و ئارام دا ڕوونشتیە.

مریشکەکا دناڤ کۆلکی دا کو دناڤ هێلینا خوە یا گەرم دا یا ڕازایی بوو، دەست ب پت پتێ کر و گوت: "ئەز ئێدی ناهێلم جارەکا دی ئەڤ چەندە ڕووبدەتە ڤە. دڤێت ئەو مریشك سپێدەیێ زوو ژ ڤێرێ بچیت. هوون ب خوە دزانن ڤان ڕۆژان ئەز دێ ل سەر هێکێن خوە کورك بم. ئەگەر هات و ئەڤ جارە من هێکێن خوە دانان و ل سەر کورك بووم، دڤێت هەموو تشت ب ئارامی بڕێڤە بچن. ئەز یا پشتڕاستم هێشتا یا ل بیرا هەوە هەموویان کا چەوا من جارا دی هەموو چیچەلۆکێن خوە یێن نازدار ژ دەستدان."

سونێ سەرێ خوە بلند کر و تەماشەی وی جهی کر یێ ئەو مریشك لێ ڕوونشتیە خوارێ. تارِیاتیا شەڤێ ژی ب هەموو هێزا خوە ڤە نەدشیا جوانی و نازداریا وێ بڤەشێریت. کەیفا سونێ گەلەك ب جوانیا وێ مریشکێ هات. پەڕێن وێ یێن ڕەنگاوڕەنگ و ڕێکخستی و تەیسووك. چ پێنەڤێت ئەڤ مریشکە هەڤالەکا گونجایە بۆ دیکلی. ژبەر هندێ سونێ حەسیدی ب وێ دبر.

سونێ هزرێن خوە کرن و د دلێ خوە دا دگوت: "تو بێژی بەری نوکە ئەز ژی هۆسا یا نازدار و جوان بووم؟ تو بێژی ڕۆژەك بهێت ئەز ژی ل سەر هێکێن خوە بڕوونمە خوار و چاڤەڕێیێ چیچەلۆکێن خوە بم هەتا ژ هێکان دهێنە دەرێ؟ خۆزی ئەو دەلیڤەیا بۆ وێ هاتی بۆ من ژی هاتبایە داکو من ژی ئەو سەربۆڕە تاقیکربایە، داکو من زانیبایە کا خوەشیا تاما دایکینیێ یا چەوایە، من ژی دڤێت وەکی وێ یا بەخت سپی بم.

سونێ هەتا نوکە ژی خوە ئامادە نەکربوو یان ژی هزرا خوە نەکربوو کا سەروبەرێ وێ یێ ژ دەرڤە دڤێت یێ چەوا بیت. لێ سەرەڕای هندێ کو ئەو نوکە یا پیسە و لەشێ وێ خڕ یێ بوویە تەقن و پەڕێن وێ یێن وەریاین، ژبەر هندێ نوکە ئەو سەرنجا کەسێ ناڕاکێشیت.

ژ نیشکەکێ ڤە وێ تەماشەی خوە کر و دلێ وێ گەلەك ب وێ سووت و ڕۆندك ژ چاڤێن وێ هاتنە خوارێ. وێ نەدڤیا کەس وێ ب ڤی دیمەنێ کرێت ڤە ببینیت. پاشی وێ ئەو چەندە ئینا بیرا خوە کو ئەو ب وێرەکی شیا ژ قەفەسکێ دەرکەڤیت و نوکە یا دگەل گیانەوەرێن باخچەی نشتیە. دوور نینە ل دەمەکێ نێزیك بشێت هێکان ژی بکەت.

ڤان هزرێن وێ یێن خوەش گەلەك نەڤەکێشان چونکی ژ نیشکەکێ ڤە هاتە بیرا وێ دڤێت سپێدێ زوو ئەو ژناڤ باخچەی دەرکەڤیت. هۆسا دیارە پاشەڕۆژا وێ یا بهێت دێ گەلەك یا ڕەش بیت. سەرەڕای ڤان خەم و کۆڤانێن مەزن، سونێ نوکە گەلەك یا برسی یە و نەوێریت ژبەر گیانەوەرێن دی بچیت تشتەکی ژی بخۆت.

سونێ وێ شەڤێ ب ئارامی و تەناهی نڤست و خەوەکا خوەش بوراند کو ئەڤە بۆ دەمەکێ درێژە ئەو هۆسا ب ئارامی نەنڤستی. ئەو سپێدەیێ زوو بەری هەموو گیانەوەرێن باخچەی هشیاربوو، هەتا بەری دیکل ژ جهێ خوە یێ بلند بهێتە خوار و بانگ ژی بدەت. لێ سونێ ما دناڤ جهێ خوە دا و بێدەنگ ما چونکی هەر چ نەبیت وێ دڤیا پیچەکا دی ژی خوەشیێ ژ جهێ خوە یێ گەرم وەربگریت، زێدەباری هندێ وێ نەدڤیا نەخوەشیێ بۆ گیانەوەرێن دی پەیدا بکەت ئەوێن هێشتا د نڤستی.

هێدی هێدی هیڤییەك د دلێ سونێ دا مەزن دبوو. ڕەنگە گیانەوەرێن دی بهێلن ئەو ژی دگەل وان بژیت، ئەڤە وەردەکەکا کووڤی یە لێ وان دەلیڤە یا دایێ دگەڵ وان بژیت، ژبەر هندێ وێ هزر دکر گیانەوەرێن دی ئاگەهـ ژ ڕەوشا وێ یا خراب هەیە لەوڕا دبیت ئەو ل سەر مانا وێ دناڤ باخچەی دا ڕازی ببن.

دیکل ژ خەوا خوە یا کوور هشیاربوو و پەڕێن خوە یێن وەستیایی ژێك ئینانە دەر و پاشی ڕابووڤە و دەست ب بانگی کر: "قیق قیق قیق."

دیکلی خوە ژ جهێ خوە یێ بلند هاڤێتە سەر ئەردی، نێزیکی وی جهێ سونێ لێ نقستی، ژبەر هندێ سونێ ترسیا و ژ جهێ خوە ڕابوو و پیچەکێ بەرەڤ دەرگەهێ کۆلکی ڤە چوو.

دیکلی گوتە سونێ: "نوکە ئەز دێ چمە سەر ڤی دیوارێ بەری یێ بلند و دێ دووبارە دەست ب دانا بانگی کەم و دڤێت هەر نوکە تو نەمینیە ل ڤێرێ. ئەو وەردەکێ هە یێ سەربەردای چ جهێن دی نینن بچیتێ لەوڕا مە یێ هێلایە ل دەڤ خوە، لێ تە جهێ خوە یێ هەی ئەو ژی قەفەسکە و دڤێت بچیە د وێری ڤە بژی و ل وێرێ دێ هەست ب ئارامیێ کەی. چ پێنەڤێت تو دزانی ژی کو زیرەکترین و وێرەکترین مریشك ژی نەشێت هەموو گاڤان ژبەر هێرشێن کووشکی برەڤیت و خوە قورتال بکەت."

دیکلی هۆسا دگەل سونێ دئاخفت خوە دا بێژی پاشایەك یێ دئاخڤیت.

پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە و گوت: "شەڤا بوری من هێلا تو دگەل مە بنڤی چونکی تو ژی ژ ڕەگەزێ باڵندەیانی. لێ ئەم نەشێین زێدەتر تە بهێلینە دناڤ خوە دا و دڤێت نوکە تو ڤەگەڕیە وی جهی یێ تو ژێ هاتی.

سونێ هیڤی ژ دیکلی کرن وێ نەدەرێخن و گوتێ: "من نەڤێت جارەکا دی ڤەگەڕمە دناڤ وێ قەفەسکا وەکی زیندانێ دا، من دڤێت ئەز ژی دناڤ ڤی باخچەی دا بژیم چونکی ئەز دزانم ل ڤێرێ کووشك نەشێت هێرشێ بکەتە سەر من و زیانێ بگەهینتە من، ئەز ئەو مریشك بووم یا ژ سەرژێکرنێ قورتال بوویم."

دیكلی ب مەندەهۆشی ڤە گوتێ: "سەرژێكرن؟"

سونێ سەرێ خوە لڤاند و دیكلی ژی تێر پێ كرە كەنی.

د دووڤ دا دیكلی هۆسا تەماشەی سونێ كر، هەروەكی بۆ وێ دیاردكر ئەو یەك پەیڤا دی بێژیت دێ دەڤێ خوە ڤەكەت و سەرێ وێ فڕینیت. دیكلی گوتێ: "كەس ب مانا تە ل ڤێرێ یێ ڕازی نینە."

ب گوهلێبوونا ڤان پەیڤان، هەموو خۆزی و هیڤیێن سونێ دووبارە مرن، وێ دمێ خوە دانا سەر یەك و سەرێ خوە چەماند و هەست ب شەرمێ كر و پاشی دیكل ژی چوو ژ دەرڤە.

دەمەكێ درێژ نەبوری، دەنگێ بانگێ دیكلی دنیا هەژاند، هەلبەت ئەڤ بانگدانە ئاماژەیەك بوو بۆ سونێ داكو ئەو یەكسەر باخچەی بجهـ بهێلیت. سونێ تەماشەی وەردەكێ كووڤی كر كو وێ گاڤێ ژ خەو هشیاربوو. لێ ما دێ ئەڤ وەردەكێ بەلنگاز شێت بۆ وێ چ كەت، چونكی ئەو د نزمترین پلەیا جڤاكی دا بوو، ژبەر هندێ وی ژی ب چاڤێن خەمگین و لێبورین ڤە تەماشەی سونێ دكر.

سونێ د ئاورینێن چاڤێن وی گەهشت، ب ڕاستی ژی وی چ ل سەر خوە نەهێلا

بوو و گەلەك هاریكاریا وێ كر. ل وی دەمێ پیچەك مایی ئەو ببیتە خوارنا كووشكی، ئەو ل وێ بۆ خوەدان و ژ مرنەكا مسۆگەر قورتال كر. هەروەسا ل وی دەمێ هەموو گیانەوەرێن باخچەی ب دژی وێ ڕاوەستیاین، ئەو ب وێرەكی ڕابووڤە و پشتەڤانیا وێ كر.

پاشی سونێ ژ کۆلکی دەرکەڤت، لێ وێ چ جهێن هۆسا نەبوون بچیتێ. ئەو چوو بن دارا خەرنۆڤێ و پیچەکێ ڕوونشتە خوارێ و بۆ ڕەوشا خوە کرە گری.

وەکی هەرۆژ، جووتیار بەرەڤ قەفەسکێن مریشکان ڤە دچوو و دگەل هندێ عەرەبانا خوە ژی پاڵددا داکو ئەو مریشکێن نەخوەش یان مری بهاڤێژتە تێدا. ل وان ڕۆژێن سونێ ژیانا خوە دناڤ قەفەسکێ دا دبوراندی هەموو هیڤی و ئارمانجێن وێ ئەو بوون جارەکێ دەرگەهێ قەفەسکێ بۆ ڤەبیت و دەلیڤەیەك بۆ پەیدا ببیت ئەو ژی بهێتە دناڤ باخچەی دا. وێ هزردکر قەت ڕۆژەکێ ئەو ناگەهیتە ڤێ هیڤیا خوە.

سونێ د دلێ خوە دا دگوت: "نوکە ئەز یا ل ڤێرێ و یا گەهشتیمە مرادا خوە ڤێجا نابیت ئەز هندی سەرێ دەرزیکێ ژی خەمان بخۆم یان پەشیمانی وان ڕۆژان ببم یێن من دناڤ قەفەسکێ دا بوراندین ل دەمەکی دەرکەڤتنا من ب خوە ڕوودانەکا سەیر بوو."

پاشی سونێ تەماشەی دارا خەرنۆڤێ کر و ب دلەکێ پڕی هیڤی ڤە گوت: "دڤێت نوکە خوە بۆ هندێ ئامادە بکەم دەست ب کرنا هێکان بکەم و پاشی ل سەر کورك ببم و ل هیڤیا چیچەلۆکێن خوە بم هەتا ژ قەلپێ هێکێ دهێنە دەرێ. پشتی ئەز ژ دەستێن کووشکی قورتالبوویم، ئێدی چ تشت نەشێن ببنە ڕێگر ل هەمبەر خەون و هیڤیێن من."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان قور قورا زکێ سونێ بوو ژ برسان دا. دەمێ وێ دیتی هەڤژینا جووتیاری یا خوارنێ بۆ گیانەوەران تێدکەت، ژ کەیفان دا دەڤێ وێ تژی ئاڤ بوو. ژبەرکو ئەو گەلەك یا برسی بوو، هەر

یەکسەر ژ جهێ خوە ڕابوو ڤە و بەرەڤ یەك ژ وان ئامانان چوو یێن خوارن تێدا. وێ ب خوە ژی نەزانی کا چەوا ئەو هۆسا بلەز گەهشتە جهێ خوارنێ ل دەمەکی ئەو گەلەك یا پۆسیدە و وەستیایی بوو و خوە نەدشیا ژ جهێ خوە بلڤلڤیت.

بەری ئەو بگەهیتە جهێ خوارنێ، وەردەکەکا دلڕەق ل بەر سینگێ وێ ڕاوەستیا و ب ئاوایەکێ دڕندە دمەکێ بهێز دانایێ و گوتێ: " تو چەوا وێرەکییێ ددەیە خوە خوارنا مە بخۆی؟"

ژبەرکو بەری نوکە وێ گەلەك پەڕێن خوە ژ دەستدابوون، سونێ نەدشیا خوە ل بەر بچووکترین هێرش ژی بگریت، ژبەر هندێ پیچەك مابوو ژبەر وێ لێدانا بهێز یا وەردەکێ ب دمێ خوە دانایە وێ، ئەو هشێن خوە ژدەست بدەت.

ئەو وەردەکە بەری دەست ب خوارنێ بکەت دمەکێ دی ژی دانایێ و پاشی بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا و دمێ خوە کرە دناڤ لەگەنا خوارنێ دا، هەر یەکسەر وەردەکێن دی هەموو ژی ب لەگەنێ وەربوون و لەگەن دناڤ خوە دا بەرزە کر ب ڕەنگەکی بەرێ کورییێن هەموویان دکەڤتنە ئاسمانی و چ جهـ بۆ سونێ نەمان ئەو ژی دمێ خوە نێزیکی لەگەنا خوارنێ بکەت.

سونێ تەماشەی وێ لەگەنا خوارنێ کر یاکو ل بەر دیکلی و مریشکا وی، ل وێرێ جهەکێ بەرفرەهـ هەبوو لێ ب چ ڕەنگان ئەو نەدوێریا خوە نێزیکی وان بکەت. دیکل گیانەوەرەکێ ب ترس و تۆڕەبوو. هەروەسا ئەو ب چ ڕەنگان نەدوێریا خوە نێزیکی سەی ژی بکەت و خوارنێ دگەل بخۆت.

ل وی دەمێ جووتیاری عەرەبانك پاڵدا، چاڤێ وی ب سونێ کەڤت. هەڤژینا جووتیاری ژی کو ب ڕەخ وی ڤە یا ڕاوەستیایی بوو و سەلکا وێ د دەستان دابوو و هێکێن مریشکان کۆم دکرن. دەمێ چاڤێ وێ ژی ب سونی کەڤتی، ب مەندەهۆشی ڤە گوتە هەڤژینێ خوە: "ئەرێ ئەڤ مریشکە چەوا مایە ساخ؟"

هەڤژینێ وێ بەرسڤا وێ دا: "ب ڕاستی ئەو مریشکەکا ڕکۆیە، ئەرێ تو بێژی ئەم وێ دووبارە بکەینە د قەفەسکێ دا؟ ئۆهـ نە، ژ نوو بیرا من هات، ئەو نەشێت ئێدی هێکان بکەت، ڤێجا تو چ دبێژی ئەم وێ سەرژێبکەین؟"

سونێ وەخت بوو ژ ترسان بکەڤیتە وێرێ، لێ پیچەکێ بێهنا وێ هات دەمێ جووتیاری گوتی: "نەخێر ئەم وێ سەرژێناکەین چونکی ئەو ب خوە مریشکەکا نەساخە و ئەڤرۆ یان سوباهی دێ مرار بیت، یان ژی ڕەنگە کووشك وێ نێچیر کەت و بخۆت."

سونێ بەردەوام ل خوارنەکێ دگەڕیا داکو بخۆت خو هەکە چ تشت بیت چونکی ئەو گەلەك یا برسی یە. نوکە هەموو مریشك یێن دناڤ کۆلکێن خوە دا خوارنێ دخۆن، لێ سونێ یا بەلنگاز ها دەمە دێ ژ برسان دا مریت.

ب ڕاستی ژی ژیانا دناڤ باخچەی دا گەلەك ژ وێ چەندێ نەخوەشتر و دژوارتر بوو یا وێ بەری هینگێ هزر بۆ دکر، لێ سەرەڕای ڤێ نەخوەشیێ هەموویێ ژی ب چ ڕەنگان وێ هزرا هندێ نەدکر جارەکا دی بچیتە دناڤ وێ زیندانێ دا و دووبارە ب ڕەزیلی بژیت.

سونێ بەرەڤ کۆما زبلی ڤە چوو هەروەکی کا چەوا وێ بەری هینگێ ددیت دیکل و مریشکا هەڤالا وی دچنە دناڤ وی زبلی دا و دمێ خوە لێ ددەن، لێ وێ ب خوە ژی نەدزانی کا ئەو ل چ دگەڕیێت. ژ نیشکەکێ ڤە وێ کۆمەکا کرمان دناڤ وی زبلی دا دیت یێن ماینە پێکڤە. ب ڕاستی کرم بۆ وێ خوارنەکا خوەش بوو، لێ ژ نیشکەکێ ڤە مریشکا هەڤالا دیکلی خوە گەهاندێ و لێ کرە هەوار: "ئەز قەت ناهێلم تو خوارنا من بخۆی!"

هندی هێز د لەشێ وێ مریشکێ هەی دمەك ل سەرێ سونێ دا، سونێ ژ ترسان دا ژ وی جهی هەموویێ دوورکەڤت و ڕەڤی، لێ بێهنا وێ مریشکێ ب ڤێ چەندێ نەهات بەلکو ڕاهێلا سونێ و بەلا خوە ژێڤە نەدکر و بەردەوام دم ددانانێ تا وی ڕادەی پیچەك مابوو ب دمێ خوە هەردوو چاڤێن وی بینتە دەرێ.

سونێ ژی بەردەوام ژبەر وێ دڕەڤی و نەدزانی ل کیڤە ژبەر وێ خوە بڤەشێریت، لێ مخابن وێ مریشکا دلڕەق هەر ڕادهێلایێ و نەدهێلا ل چ جهان ئارام بیت هەتا ژ باخچەی هەموویێ کریە دەرێ. هەرچەندە هەموو ئەندامێن لەشێ وێ بریندار ببوون و خوین ژێ دهات، لێ ژبەر برسێ وێ ئاگەهـ ژ چ نەبوو.

سونێ چوو ناڤ بیستانی و ل وێرێ ب نەچاری دەست هاڤێتە خوارنا بەلگەکێ کەلەمیێ، ئەڤێ چەندێ هاریکاریا وێ کر برس و تێهنا وێ هەردوو پێکڤە بشکێن.  ژ ترسێن هندێ دا نەکو جارەکا دی چاڤێ دیکل و مریشکێ ڤێ بکەڤیت و بهێن وێ ژناڤ بیستانی ژی بکەنە دەرێ، سونێ جار جار سەرێ خوە بلند دکر و تەماشەی دەوروبەرێن خوە دکر.

سونیٚ ئەو بیستان ژی بجهـ هیٚلا چونکی ئەڤ بیستانە ب تنیٚ ل وی جهی نەبوو، بەلکو گەلەك بیستانیٚن دی ژی ل گەلەك جهیٚن دی هەبوون، ویٚ چەندین بیستانیٚن دی ییٚن فیٚقی و کەسکاتی ل بەر سینگیٚ خوە دیتن لەوڕا ئەو چوو دناڤ دا و ب دلیٚ خوە تیٚر خوارن خوار.

پشتی ویٚ تیٚر خوارن خواری، ئیٚدی سونیٚ شیا خوە ل سەر پیٚن خوە بگریت. هەروەسا ئەو گەلەك یا ب کەیف بوو چونکی چ گیانەوەریٚن دی ییٚن د ناڤ باخچەی هەتا دیکل و مریشك ژی نەشیٚن بهیٚنە جهەکیٚ هۆسا ییٚ خوەش و پڕی خوارن و مایێ خوە د ژیانا ویٚ بکەن یان فەرمانان لیٚ بکەن.

ئەو ڕۆژا سونێ ژ ناڤ باخچەی هاتیە دەرێخستن، هەر ژ سپێدەیێ تاکو ئێڤاری دناڤ زەڤی و بیستانێن پڕی کەسکاتی و داروبار دا دەمێ خوە دبوراند. ژ پێخەمەت هندێ ئەو برسا خوە ژ بیر بکەت و زکێ خوە یێ ڤالا تێر بکەت، سونێ مژوولی لێگەڕیانا خوارنێ بوو دناڤ وان بیستان و زەڤیيان دا. هەروەسا وێ هندەك جاران ب دمێ خوە ئاخ دکۆلا و ل کرمان دگەڕیا و ب ڤێ چەندێ ئەو شیا گەلەك کرمان بخۆت کو وێ قەت پێشبینی نەدکر ئەو دێ هندە خوارنێ بدەستڤە ئینیت ل دەمەکی دناڤ قەفەسکێ دا چ جاران هندە خوارن بۆ نەهاتبوو پێشکێشکرن.

وەردەکێن ناڤا باخچەی ل دانێ سپێدەیێ ددەرکەڤتنە ژ دەرڤە و هەتا ئێڤاری ل وان جهان بۆ خوە دگەڕیان، لێ دیکل و مریشکا خوە مانە دناڤ باخچەی مالێ دا، ژبەر ڤێ چەندێ سونێ شیا وێ ڕۆژێ ب دلشادی بژیت و تێر خوارنێ بخۆت بێی کو یەك زیانێ بگەهینتە وێ.

دەمێ دنیا بوویە شەڤ، سونێ هەست ب ترسێ کر، چونکی ل سەر وێ پێدڤی بوو ئەو جهەکی ئارام بۆ خوە ببینیت و یێ دوور بیت ژ مەترسیا کووشکی داکو وێ شەڤێ لێ بنڤیت. سونێ ل وان جهان هەموویێ گەڕیا لێ چ جهێن گونجایی نەدیتن لێ بنڤیت یان خوە لێ بڤەشێریت، ژبەر هندێ ئەو نەچاربوو جارەکا دی ڤەگەڕیتە ناڤ باخچەی.

ل وی دەمی، هەموو گیانەوەرێن باخچەی ڤەگەڕیابوونە مال و هەر یەك چووبوو سەر جهێن خوە یێن نڤستنێ، لێ سەیێ پیر ب تنێ مابوو ل بەر دەرگەهێ داکو زێرەڤانییێ ل باخچەی بکەت. دەمێ چاڤێ سەی ب سونێ کەڤتی، گەلەك تۆڕەبوو و بێی ب خێرهاتنا وێ بکەت، گوتێ:

"ئەڤرۆکە مە چ جهـ نینن تو لێ بنڤی، کەسێ ئەو وێرەکی ژی نینە پشتا تە بگریت."

پاشی سە چەندین جاران ل دور سونێ زڤڕی و بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "گەف یێ ل وەردەکێ کووڤی ژی هاتینە کرن ئەگەر هات و ئەو پشتا تە بگریت یان پت پتێ بکەت، ئەو ژی دێ ژناڤ باخچەی هێتە دەرێخستن، ژبەر هندێ چاڤەڕییێ هندێ نەبە ئەو بشێت جارەکا دی پشتا تە بگریت."

سونێ پیچەکێ ژ سەی دوور کەڤت و پاشی ڕاوەستیا و دڤیا بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت.

سەی دیسان گوتێ: "زێدەباری ڤێ چەندێ، مریشکا باخچەی یا بەرهەڤییێن خوە دکەت بۆ دانانا هێکان داکو ل سەر کورك ببیت، ژبەر هندێ یا ل سەر من پێدڤیە ئەز نەهێلم چ قەرەبالغ دناڤ باخەیی دا پەیدا ببیت تاکو ئەو ب سلامەتی هێکێن خوە ددانیت و دکەتە چیچەلۆك. ژبەر ڤێ چەندێ ئەز تە شیرەت دکەم هەر نوکە ژ ڤێرە دوور بکەڤە و چ سەرگێژیان بۆ مە دروست نەکە."

سەیێ پیر دترسیا مریشکا باخچەی ژ وی تۆڕە ببیت و بهێت شەڕێ وی بکەت، هەلبەت ل وی دەمی دێ بۆ سەی شەرمزارییەکا مەزن بیت هەکە مریشکەکا ژ وی لاوازتر هات و دمەك دانایێ و دفنا وی بریندار کر، ل وی دەمی سە دێ بیتە پێتڕانکێ هەموو گیانەوەران. داکو سە تۆڕە نەبیت، سونێ ب هێمنی و زمانەکێ نەرم هیڤی ژ سەی دکرن دەلیڤەیێ

بدەتێ ئەڤ شەڤە ژی دناڤ باخچەی دا بنڤیت. سونێ گوت: "من چ جهێن دی نینن ژبلی ڤێرێ ئەز لێ بنڤم."

سونێ نەدڤیا وەکی شەڤا بوری ب زۆری بچیتە د ژوور ڤە بەلکو ب تنێ داخوازا وێ ئەو بوو ل جهەکێ نێزیکی سەی و ل ژێر سەرپەرشتییا وی بنڤیت، ب تنێ وێ دڤیا دناڤ کوژیەکێ باخچەی دا ب تەناهی بنڤیت و ئێدی یا گرنگ نینە ئەو جهە یێ چەوا بیت.

سەی گوتێ: "قەت ئەڤ چەندە چێنابیت، ژ نوکە وێڤە ئەز دێ گەلەك یێ مژوول بم چونکی دێ مریشك هێکێن خوە دانیت و پێدڤە ئەز گەلەك زێرەڤانییێ لێ بکەم ژبەر هندێ من ئاگەهـ ژ تە نابیت و نەشێم چاڤدێریا تە بکەم."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، سەی ئاماژە کرە جهەکێ دناڤ باخچەی دا کو ل وێرێ کۆمەکا ئالفی لێ هەبوو و کونەك تێدا هاتبوو کرن و ب شەڤێ کووشك دشێت ب سانەهی دناڤ وێ کونجێ ڕا بهێتە دناڤ باخچەی دا و زیانێ بگەهینتە گیانەوەران.

سەی دیسان گوت: "ب ڤی پیراتییێ ڤە، دڤێت ژ نوکە وێڤە ئەز باش ل ڤی جهی یێ هشیار بم و زێرەڤانییێ لێ بکەم داکو ڕێکێ ل کووشکی بگرم. مریشك ژی پشت بەستنێ دکەتە سەر من داکو خوە بپارێزیت، لێ هەکە ئەو بزانیت هێشتا تو یا ل ڤێرێ دێ گەلەك تۆرە بیت، ب ڕاستی ژی من نەڤێت ئەو بهێت شەڕێ من بکەت."

سونێ گوت: "ئەز سوزێ ددەمە تە ئەز چ دەنگان ژ خوە نەئینم و خوە پەڕەکێ خوە ژی نەلڤینم و کەس هەست ب مانا من ل ڤێرێ نەکەت،

بهێله ئەڤ شەڤه ئەز ل بەر دیوارێ باخچەی بنڤم یان ژی دناڤ یەك ژ کوژیێن باخچەی دا، دووباره ئەز سوزێ ددەمه ته دگەل ئەلندا سپێدەیێ ژ خەو هشیار ببم بەری دیکل بانگی بدەت."

- "داخوازا تشتەکی ژ من نەکه هەکه د شیانێن من دا نەبیت بۆ ته بجھ ببینم، ب درێژاهیا ژیانا خوه ئەز زێرەڤانێ باخچەی مه و نوکه من نەڤێت ئەز کارەکێ هۆسا بکەم بەروڤاژی کارێ من بیت و ژ یاسایێ دەرکەڤم."
- "بۆچی ئەز ژی نەشێم وەکی هەموو گیانەوەرێن دی دناڤ باخچەی دا بژیم؟ ئەز ژی وەکێ وێ مریشکم."
- "ئاخ تو چەند مریشکەکا دەبەنگی! چەوا تو هۆسا یا ژ خوه ڕازی و ب ڤی ڕەنگی هزر دکەی؟ ڕاسته هوون هەردوو مریشکن، بەلێ تو نە وەکی وێی و چەوا هەتا نوکه تە ئەڤ چەندە نەزانیه؟ کا چەوا کارێ من ئەوه ئەز ل ڤێرێ زێرەڤانییێ بکەم و دیکل سپێدەیێ زوو ژ خەو هشیار ببیت و بانگ بدەت، تو ژی بۆ هندێ یا هاتیه ئافراندن دناڤ قەفەسکێ دا بژی و هێکان بکەی نەك دناڤ باخچەی دا پیاسان بکەی! ئەڤ چەندە ڕێسانە و کەس نەشێت بگوهۆڕیت."
- "باشە دێ چ ڕوودەت ئەگەر هات و من پێ ل ڤان ڕێسایان دانا؟"
- " چ تەمساڕیان نەکە و خوه نەکە پێتڕانك."

سەیێ پیر سەری ٚخوه هەژاند و بەرێ خوه ژێ وەرگێڕا و پاشی بەرەڤ جھێ خوه چوو. سونێ هەستپێکر سەی نەڤێت هاریکاریا وێ بکەت و ئەگەر هات و ئەو زێدەتر بمینته ل وێرێ، دوور نینه سەیێ پیر ژ وێ تۆڕە ببیت و زیانێ بگەهینتێ هەروەکی کا چەوا بەری نوکه دیکلی ئەو

شەرمزار کری و بێی هزرەکێ بۆ بکەت گوتیێ کەسێ نەڤێت تو بمینیە ل ڤێرێ."

سونێ ژ ناڤ باخچەی دەرکەڤت لێ وێ چ جهێن دی نەدیتن بچیتێ، ژبەر هندێ ب نەچاری ڤە چوو بن دارا خەرنۆفێ و چاڵەکا بچووك کۆلا و تێدا ڕوونشتە خوار داکو شەڤا خوە ل وێرێ ببورینیت. چونکی ئەو جهـ ژ دەرڤەی باخچەی بوو لەوڕا دەمێ سەی تەماشەی وێ کری نەشیا زێدەتر مایێ خوە تێ بکەت یان ژ وێرێ ژی بکەتە دەرێ. سونێ یا تۆڕە و بێهن تەنگبوو، دگەل هندێ یا وەستیایی ژی بوو.

ئێدی مریشکا باخچەی هێکێن خوە دانان و پترییا دەمێ خوە دناڤ هێلینا خوە دا دبوراند و ل سەر هێکان یا ڕوونشتیبوو، هندەك جاران ژ جهێ خوە ڕادبوو و ئاخ دکۆلا و کرم نێچیر دکرن. لێ ب چ ڕەنگان ژ باخچەی دوور نەدکەڤت. دەمێ سونێ ئەڤ چەندە ب چاڤێن خوە ددیتی گەلەك خەمگین دبوو.

سونێ نەدزانی کا چەند ڕۆژ بورینە دەمێ وێ دوماهیك هێك کری، لێ نوکە جارەکا دی پەڕێن دورماندوری حەفکا وێ یێن هاتین و هێزا وێ ژی وەکی بەرێ یا زڤڕی. سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ ئەو هەست ب بەختەوەریەکا ڕاستەقینە ناکەت چونکی ئەو نەشێت دووبارە هێکان بکەت، ژبەر هندێ ئەو یا بێهیڤی بووی.

هندەك جاران وێ هەست ب ترسێ دکر ب تایبەت دەمێ هزرا خوە دکری کو ئەو نەشێت جارەکا دی هێکان بکەت، هەر ژبەر هندێ، ڤێ هزرێ کارتێکرنەکا مەزن ل سەر وێ دکر و ب خەم دئێخست. ژیانا ئەو نوکە

تێدا دژیت کو ب تنێ دناڤ باخ و بیستانان دا دگەڕیت و خوارنێ پەیدا دکەت، چ جوداهی دگەل ژیانا وێ یا بەری نوکە دناڤ قەفەسکێ دا نینە. سونێ بزاڤ دکر خوە ژ ڕەشبینییێ قورتال بکەت، ژبەر هندێ وێ د دلێ خوە دا دگوت: "هۆسا دیارە ئەز دێ نوکە هێکەکێ کەم."

هەی ژارێ سونێ، وێ هزردکر هەما کورکەك بۆ خوە کولاێ و تێدا ڕوونشتە خوار، هەما ئێدی ب سانەهی دێ دەست ب کرنا هێکان ژی کەت، لێ هندی هەر شەڤ دلێ وێ هۆسا یێ ب ترس بیت نەکو کووشك بهێت وێ بخۆت، ئەو نەشێت چ هێکان بکەت لێ وێ هزردکر ئەڤ چەندە ب تنێ هێجەتن.

گەلەك جاران هەتا سپێدەیێ ئەو دما هشیار و چاڤێن کووشکی ژی دناڤ تارپاتیێ دا ل وێ بوون تاکو دەلیڤەیەکا گونجایی ببینیت و وێ نێچیر بکەت، لێ هەر دەمێ بێهنا کووشکی هاتبایە سەی دا ڕەویت، ژبەر هندێ کووشك نەدوێریا خوە نێزیکی وێ بکەت. سونێ هزردکر ب ڤی ڕەنگی ئەو یا ئارام و پاراستییە خوە هەکە دناڤ باخچەی ژی دا نەبیت لەورا ئەو دشێت ئێدی بەردەوامیێ بدەتە ژیانا خوە. جار جارا وێ د دلێ خوە دا دگوت: "ئەگەر ئەز ئێدی هێکان نەکەم، ژیانا من چ تام تێدا نامینیت."

سونێ هەست پێ دکر ئێدی ئەو یا ب تنێ یە چونکی هەڤالێ وێ، وەردەکێ کووڤی، ئێدی بۆ خوە هەڤالەکا نوو یا گرتی ئەو ژی وەردەکەکا سپی بوو وەکی ڕەنگێ بەفرێ و هەموو گاڤان ئەو پێکڤەبوون، سونێ تێبینییا هندێ دکر ئەگەر جارەکێ هەڤالا وی یا نوو دگەل نەبیت، ئەو ژی بەرەڤ چ جهان ناچیت.

سونێ ل ڕۆژا یەکێ نەزانی چ  بکەت، ژبەر هندێ ئەو ب دووڤ کۆما وەردەکان کەڤت هەتا گەهشتینە سەر برکا ئاڤێ. سونێ دیت وەردەکێ کووڤی یێ دگەل هەڤالا خوە یا نوو شەڕێ ئاڤێ دکەن و جار جار یێن دچنە سەر پشتا هەڤدوو. هەرچەندە کەیفا وێ گەلەك ب ڤێ چەندێ هاتبوو کو هەڤالێ وێ یێ کەڤن نوکە نەمایە ب تنێ، لێ ڤێ چەندێ بیرا وێ ل وێ ب خوە دئینا کو نوکە یا مایە ب تنێ و ڤێ چەندێ وەکی نەخوەشیەکا دومدرێژ ئەو دئێشاند.

هەر ژ وی دەمێ وەردەکێ کووڤی بۆ خوە هەڤالەکا نوو دیتی، ئێدی وەکی هەرجار ب دووڤ کۆما وەردەکان نەدکەڤت، هندەك شەڤان هەما هەر نەدزڤڕی مال و دگەل هەڤالا خوە دما ل چوولی.  ل وان شەڤێن ئەو نەڤەدگەڕیایە ناڤ باخچەی، سونێ هەتا سپێدەیێ ژ خەمان دا نەدنڤست و هزرێن وان دکرن نەکو تشتەکێ خراب ب سەرێ وان بهێت.

ڕۆژەکێ ل دەمێ نیڤرۆ سونێ مژوولی خوارنێ بوو، چاڤێ وێ ب کۆما وەردەکان کەڤت یێن بەرەڤ برکا ئاڤێ دچن، لێ ڤێ جارێ وەردەکێ کووڤی دگەل نینە. چاڤێ سونێ ما ل وان هەتا هەموو ژ گرکی بورین و پاشی ب دووڤ وان کەڤت بەلکی وەردەکێ کووڤی ببینیت و دلێ وێ پیچەکێ ئارام ببیت. دەمێ گەهشتینە سەر برکێ ژی وێ دیت ئەو ل وێرێ نینە، هەروەسا وەردەکا بەفرین ژی ل چ جهان نەبوو.

سونێ د دلێ خوە دا پرسیار کر: "تو بێژی ئەو هەردوو پێکڤە ژ ڤێرێ چوو بن، لێ ئەز باوەرناکەم چونکی بەری نوکە چ نیشانێن هندێ ل دەڤ نەبوون ئەو ژ ڤێرێ بچن؟ ئەو گەلەك هەڤالێ من بوو، ئەز باوەرنەکەم

بێی خاترخواستن ئەو ڤێرێ بجهـ بهێلیت." پاشی وێ سەرێ خوە هەژاند و ب گرِنژین ڤە گوت: "ئەگەر یەك ژ ڤێرێ بچیت، دڤێت ئەز بم نە ئەو چونكی من چ جهـ ل ناڤ باخچەی نینن و كەس حەز ژ من ناكەت."

نوكە بۆ یەكەمین جار سونێ د ژیانا خوە دا هەستپێكر ئەو یا ژ قەفەسكێ خەریب بووی، چونكی ل وێرێ ئەو دشیا رِۆژانە هێكان بكەت لێ نوكە وێ ئەو شیان نەماینە. سونێ دیسان گوت: "ئەگەر ئەز ژی وەكی هەموو مریشكێن دی د ژیانەكا خوەش و ئارام دا ژیابام، نوكە ئەز نەدكەڤتمە ڤێ رِەوشێ و نەدمامە ب تنێ، نوكە دێ بێژی پێن من یێن هاتینە گرێدان و ئەز نزانم چ بكەم یان بۆ كیڤە بچم."

پاشی سونێ سەرێ خوە بلند كر و تەماشەی وێ رِێكێ كر یا ئەو بەری نوكە ژ باخچەی هاتی، وێ دیت ئەو گەلەك یا ژێ دوور كەڤتی، ئەڤ چەندە بۆ وێ بۆ خوەش هێجەت و گوت: "من قەت نەڤێت جارەكا خوە نێزیكی وی باخچەی بكەمە ڤە."

بەری نوكە سونێ ژبەر وەردەكێ كووڤی حەز ژ باخچەی دكر و سەبرا وێ ل وان جهان دهات، لێ نوكە ئەو ل وێرێ نینە لەورِا ژی باخچەی چ رِامانا خوە ل دەڤ سونێ نەمایە. هەر ژبەر ڤێ چەندێ سونێ حەزنەكر جارەكا دی ڤەگەرِیتە وی جهی.

ژ لایەكێ دی ڤە، سونێ دڤیا بۆ هەیامەكا درێژ ل بەر تیرۆژكێن رِۆژێ یێن گەرم بنڤیت و خوە ژ هەموو گیانەوەران دوور بكەت. وێ گوت: "بالندەیێن باخچەی كەس حەز ژ من ناكەت، ڤێجا ما دێ بۆچی ئەز چمە دەڤ وان ڤە."

سونێ گەهشتە وێ باوەریێ کو ئێدی نەچیتە نێزیکی باخچەی و ل بن سیبەرا دارا خەرنۆفێ ژی نەنقیت.  هەر ل وی دەمی چاڤێ سونێ ب مێرگەکا تژی گولێن ڕەنگاوڕەنگ ل پشت گرکی کەڤت، بەری نوکە وێ ئەڤ مێرگا هۆسا یا جوان نەدیتبوو چونکی دبیت بەری نوکە ئەڤ گولە لێ نەبووینە، لێ نوکە یا پڕبووی ژ گولێن ڕەنگاوڕەنگ و گژوگیای و سیبەرەکا باش یا پەیداکری. سونێ ب دیتنا ڤی دیمەنی دلخوەش بوو و گوت: "نە یا گرنگە ژ نوکە وێڤە من جهەك دناڤ باخچەی دا هەبیت، چونکی ئەڤە نوکە من بۆ خوە جهەکێ باش دیت."

تشتێ نەچاڤەڕێکری ئەوبوو دەمێ سونێ نێزیکی وێ مێرگێ بووی، وێ گوهـ ل دەنگێ ڤێژیا گیانەوەرەکی بوو کو ئەو مێرگ هەموو هەژاند. هەرچەندە ماوەیێ وێ ڤێژیێ یێ کورت بوو لێ ژ ترسان دا پەڕێن سونێ هەموو بلند بوون. پشتی هینگێ هەر یەکسەر بێدەنگیێ پەڕێن خوە ب سەر وێ مێرگێ دادانەڤە.

سونێ دیت گیانەوەرەکێ سەیر کو کوریەکا کورت و ستوور هەبوو، ب شێوەیەکێ گەلەك بلەز دبەر وێ ڕا بوری و خوە دناڤ گیای دا ڤەشارت و ل بەر چاڤێن وێ بەرزەبوو. چ شینوارێن وی گیانەوەری ل واران هەموویێ نەمان ب تنێ لڤینا وی گیای نەبیت یێ چوویە دناڤ دا.

سونێ د جهێ خوە دا ڕەپ ڕاوەستیا، هۆسا دیاربوو ئەو ڤێژیا بلند و ب ترس دلێ وێ ڤەتاند. ژبەر هندێ وێ هەست ب دلڕابوونێ کر و چاڤێن خوە دانانە سەر یەك، لێ هەموو تشت ب ڕەنگێ سۆر دهاتنە پێش چاڤێن وێ. لێ داکو ئەو خوە ژ کاریگەرییا ڤی دیمەنێ نەخوەش قورتال

بکەت، وێ چاڤێن خوە ڤەکرن و باش تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر، لێ هندی چاڤێن وێ قەترە دکری ب تنێ وێ باخ و بیستان و ڕەز ددیتن نەك زێدەتر. سونێ ژ دەڤ خوە گوت: "هەی سەربەردای."

نوکە سونێ یا هەست ب تشتەکێ سەیر دکەت کو وەکی وی هەستی یە دەمێ ئەو دناڤ گۆڕستانا مریشکێن مری دا و کووشکی هێرش کریە سەر وێ. سونێ دڤیا هەر زوو وی جهی بجهـ بهێلیت، لێ مایتێکرنا وێ یا زێدەبوو ئەگەر ئەو بەرەڤ وێ مێرگێ ڤە بچیت. سونێ نەدشیا ل جهێ خوە بڕاوەستیت چونکی وێ هزردکر وەردەکێ کووڤی یێ ل جهەکی گازی وێ دکەت.

وێ د دلێ خوە دا دگەل خوە دئاخفت و دگوت: "دڤێت ئەز یا هشیار بم و باش تەماشەی هەر چوار ڕەخێن خوە بکەم، سونێ تە خەم پێ نەبیت چونکی هەموو تشت د ئارامن و کەس نەشێت نوکە زیانێ بگەهینتە تە."

سونێ هێدی هێدی پێنگاڤ دهاڤێتن و پیچ پیچە تڕسا وێ ژی کێم دبوو، وێ هزردکر ئەو گیانەوەرێ کریە ڤێژی وەردەکێ کووڤی بوو. هەتا نوکە وێ گوهـ ل چ گیانەوەران نەبوویە ب ڤی شێوەیێ تڕسناك بکەنە ڤێژی. دگەل ڤێ چەندێ ژی نوکە ئەو یا وێرەکە و خوە بۆ هەر ڕوودانەکا نەپێشبینیکری یا ئامادەکری خوە هەکە کووشك ژی بهێتە د ڕێکا وێ دا چونکی دوور نینە هەڤالێ وێ کەڤتبیتە د مەترسیێ دا و نابیت ئەو دەستان ژێ بەردەت.

سونێ چ تشت نەدیتن، وێ باش تەماشەی وان جهان کر لێ چ تشت نەکەڤتنە بەر چاڤێن وێ. هەر چ نەبیت پەڕ یان چەنگەکێ وێ ل بەر دەڤێ کووشکی مابیتە ل وێرێ. لێ ژبلی گژوگیای چ تشتێ دی ل ڤێرێ نینە. ژبەر ڤێ چەندێ وێ هزرکر ڕەنگە چ تشتێ ب مەترسی ڕوونەدابیت و ب تنێ ئەو دەنگێ هاتیە گوهێن وێ ژی چ ڕاستی بۆ نەبیت هەما ب تنێ دەنگڤەدانەك بیت د سەرێ وێ دا.

هێدی هێدی وی هەست ب بێهنفرەهیێ دکر و چوو دناڤ مێرگا گولان دا، وێرێ جهەکێ خوەش و ئارام بوو ئەگەر بۆ خوە هێلینەکێ لێ دروست بکەت. دنیایەکا جوانە و هەمووو دەوروبەرێن وێ ب گولێن کووڤی یا هاتیە خەملاندن. لێ ژ نیشکەکێ ڤە تشتەکی سەرنجا وێ ڕاکێشا .

– "ئۆی خودا ئەڤە چیە ئەز دبینم؟"

سونێ سەرێ خوە پتر برە هنداڤی وی جهی، چەندین جاران چاڤێن خوە گرتن و ڤەکرن کا ئەرێ ئەو تشتێ ئەو ب چاڤ دبینیت ڕاستە یان خەونە. پاشی سەرێ خوە بلند کر و گوت: "چەندا جوانە!"

دناڤ وان گولان دا، هێکەکا ڕەنگ سپی یا سەر ب شینی ڤە کەڤتە پێش چاڤێن وێ، لێ ب چ پەڕان نەهاتبوو نخافتن. ئەو هێکەکا مەزن و جوان بوو، لێ تشتی سەیر ئەو بوو کەس ل دەڤ وێ هێکێ نەبوو و چ نیشانێن هندێ دیار نەبوون کو دایکا وێ یا ل سەر کورك بووی.

سونێ تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر دا ل دایکا وێ هێکێ بگەڕیت، تەماشەی برکا ئاڤێ ژی کر لێ چ باڵندە ل وی جهی هەموویێ نەبوون. هەر زوو دلێ وێ بلەز خوە قوتا و نەشیا خوە ڕاگریت.

– "تو بێژی ئەڤ هێکا جوان یا کێ بیت؟ دڤێت ئەز نوکە چ بکەم؟"

سونێ دوو سێ جاران هات و چوو و هزرێن خوە دکرن، لێ دل نەدا هۆسا ب سانەهی وێ هێکێ ب تنێ بهێلتە ل وێرێ و پشتا خوە بدەتێ.

– "ئە ز باوەرناکەم ئەڤ هێکە بشێت خوە بشکێنیت."

سونێ بڕیار دا بمینتە ل وێرێ هەتا دایکا وێ هێکێ دهێت، پاشی چوو سەر هێکێ ڕوونشتە خوار و ل بن خوە ڤەشارت هێشتا سار نەبووی چونکی هۆسا یا دیارە دایکا وێ ژ نوو یا کری. سونێ دگەل هێکێ ئاخفت: "هێکا من یا جوان، ئەڤە تو تووشی چ ئاریشەیەکێ بوویە و مایە ب تنێ؟ لێ تە خەم پێ نەبیت ئەز دێ چاڤێ خوە دەمە تە و تە گەرم کەم."

ب ڤێ چەندێ، هندی ترسەکا بەری هینگێ د دلێ سونێ دا هەی ڤەڕەڤی، ئارامی و بێدەنگییێ ژی ب تەمامی پەڕێن خوە ل سەر وێ مێرگا گولان دانابوون و چەند دەم دبوری دلێ سونێ ژبەر ڤێ هێکێ ب کەیفتر لێ دهات کو بەری نوکە چ جاران وێ هەست ب کەیفەکا هۆسا مەزن نەکریە. سونێ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك و هەست ب گەرماتییێ د ناخێ خوە دا دکر.

ئەو مێرگا گولان بۆ سونێ گەلەك ئارامتر بوو ژ مانا وێ ل دەرڤەی باخچەی، پشتی هینگێ هەر زوو دنیا بوو تاڕی و بایەکێ ئارام و چپکێن خۆناڤێ ئەو هەمبێز دکر. سونێ ژبەر خوە گوت: "من دزانی ئەز ئێدی نەشێم چ هێکان بکەم، لێ ئەڤ چەندە نە ئاریشەیە چونکی ئاها نوکە ئەز یا ل سەر هێکەکێ ڕوونشتیم و خەونا من بجهـ هات. ڕاستە ئەو هێکەکا ب تنێ یە لێ بۆ من هندی دنیایەکێ یە."

سونیّ دڤیا باوەریێ بۆ خوە دروست بکەت کو ئەڤە یەکە ژ وان هێکان یێن ڕۆژێن بەری نوکە وێ کرین و ژ دەستداین، لێ ئەو ترسە هەر د دلێ وێ دا بوو نەکو دایکا ڤێ هێکێ بزڤریت و هێکا خوە ببەت، ژبەر هندێ ب درێژاهیا وێ شەڤێ چاڤێ وێ ل تاریاتیا ژ دەرڤەی مێرگا گولان بوو، لێ خوەشبەختانە هەتا بوویە سپێدە ژی کەس نێزیکی وێریێ هەموویێ نەبوو.

سونیّ دمێ خوە ل وان موویێن سنگێ خوە ددا یێن دکەڤتیە سەر هێکێ و ژێ ڤەدکرن دا کو ب شێوەیەکێ باشتر هەست ب هێکێ بکەت و لەشێ وێ گەرم بکەت. هێدی هێدی هیڤیەك د دلێ وێ دا مەزن دبوو کو ئەو هێکا نوکە ئەو ل سەر ڕوونشتی هێکا وێ یا ڕاستەقینەیە. سونیّ گوت: "ئەڤە جەگەرا منە، پشتی ئەو ژ هێکێ دهێتە ژ دەرڤە دێ هەموو سەرهاتییێن خوە بۆ وێ بێژم."

ڤیانا سونیّ بۆ وێ هێکێ ئێدی هند مەزن بوو ڕەنگە خوە هەکە وێ گاڤێ دایکا وێ ژی هاتبایە وێریێ، سونیّ ڕازی نەدبوو ل سەر هێکێ ڕابیت و بۆ بڤەگەڕینیت. نوکە هزرا وێ هەموو یا ل سەر هندێ ئەو ڤێ هێکێ باش گەرم بکەت، تا وی ڕادەی ئەو دشیا هەست ب لێدانێن دلێ چیچەلۆکا دناڤ هێکا دبن خوە ڤە بکەت.

دنیا بوو سپێدە، ئەو ڕۆژ بۆ سونیّ گەلەك یا جودا بوو ژ دوهی چونکی وێ هزر دکر ئەو ژ نوو یا ژ دایکبووی. سونیّ ئەو هێك ب هندەك پەڕێن خوە نخافت و ژناڤ مێرگا گولان دەرکەڤت. پاشی وێ دەڤێ خوە هاڤێتە بەلگەکێ گیای یێ درێژ کو گەلەك چیکێن خۆناڤێ ل سەربوون.

سونیٚ نەدشیا گەلەك ژ وی جهی دوور بكەڤیت چونكی ئەویٚ گرنگیەكا مەزن ددا هێكیٚ. ژبەر ڤیٚ چەندیٚ ئەو یا نەچاربوو هەر خوارنەكا ل نێزیكی وێریٚ هەبیت بخۆت داكو بمینتە ساخ.

جارەكا دی سونیٚ كۆما وەردەكان دیت یێن بەرەڤ بركا ئاڤیٚ دچن، سەركێشیٚ وان ییٚ ل پێشیا وان دچیت و تێشكێن وان ل دوماهییٚ دچوون. ویٚ چ شینوارێن وەردەكیٚ كووڤی دگەل وان نەدیتن. دبیت ژی وی بۆ هەتا هەتاییٚ باخچە بجهـ هێلابیت، ژبەر هندیٚ ئەو دووبارە خەمگین بوو. هیڤیا سونیٚ ئەو بوو دەلیڤەیەك بۆ ویٚ هەلكەڤتبایە خاترا خوە ژ هەڤالیٚ خوە ییٚ دلسۆز بخوازیت، لیٚ تشتیٚ باش ئەوە نوكە سونیٚ هەست ب هندیٚ ناكەت ئەو یا ب تنیٚ یە.

سونیٚ ل وان جهان گەڕیا و هندەك بەلگ كۆمكرن داكو پتر هێكیٚ بنخێڤیت و گەرم بكەت، سونیٚ بەری دووبارە بزڤڕیتە دناڤ مێرگیٚ دا ڤە، دەنگیٚ قەرەبالغەكیٚ ل پشت ویٚ هات. سونیٚ هند ترسیا چ نەمابوو ئەو بەلگ ژ دەڤیٚ ویٚ بكەڤن یێن بەری نوكە ویٚ بۆ نخافتنا هێكیٚ خڕڤە كرین.

دەمیٚ ئەو ل پشت خوە زڤڕی، ویٚ هند دیت وەردەكیٚ كووڤی ییٚ ل پشت ویٚ ڕاوەستیای، وەردەكی ب دوو چاڤێن وەستیایی و خەمگین تەماشە ویٚ دكر، بەروڤاژی سونیٚ هەست ب بەختەوەرییٚ كر كو جارەكا دی ئەو دیتیەڤە لیٚ د جهیٚ خوە دا ڕەپ ڕاوەستیا چونكی ویٚ هەست ب دوودلییٚ كر نەكو ئەڤ وەردەكە هێكا ویٚ ببینیت.

وەردەكێ كووڤی بێی كو یەك پەیڤ ژی باخڤیت، تەماشەی سنگێ سونێ یێ ڕووت و بێ موو كر. پاشی ل سەر گیای ڕوونشتە خوار، لێ سونێ چوو دناڤ مێرگێ دا و ل سەر هێكێ ڕوونشتە خوار.

سونێ هەست ب خوەشیەكا مەزن كر دەمێ دیتی جارەكا دی وێ هەڤالێ خوە دیتەڤە ب تایبەت ل دەمەكێ هۆسا. هەرچەندە دلێ سونێ گەلەك ما ب وی ڤە چونكی یێ خەمگین بوو لێ ئەو وێرەكی نەبوو پرسیارێ ژێ بكەت كا چ ڕوودایە. وەردەكێ ب خوە ژی چ تشت نەگوتن ب تنێ ئەو نەبیت هەر بێهن بێهنە سەرێ خوە ژناڤ پەڕێن خوە دئینا دەر و ب خەمگینی ڤە تەماشەی سونێ دكر.

سونێ د دلێ خوە دا پرسیار دكر: "ئەرێ بۆچی ئەو هۆسا یێ دامایە؟ بۆچی وەردەكا بەفرینا هەڤالا وی دگەل نینە؟"

وەردەكێ كووڤی وێ شەڤێ ما ل دەڤ سونێ هەتا ڕۆژا پاشتر، د ڤی دەمی دا سونێ ژی هەست ب خەمگینیێ دكر چونكی وێ ددیت هەڤالێ وێ گەلەك یێ پۆسیدە و دامایە، لێ تشتێ خوەش بۆ سونێ ئەو بوو وەردەكی چ پرسیار ل دور هێكا وێ ژێ نەكرن.

دەمێ ڕۆژا پاشتر ڕۆژ هەلاتی، وەردەكێ كووڤی ژی مینا هەموو وەردەكێن دی بەرەڤ بركا ئاڤێ چوو، پاشی دووبارە هاتە دەڤ سونێ و ماسیەك ب دمێ خوە گرتبوو دانا نێزیكی مێرگا گولان و چوو.

ئێدی هەموو گاڤان وەردەکێ کووڤی ماسی بۆ سونێ دئینانە بەر دەرێ هێلینا وێ، ب ڤی ڕەنگی بێی کو ئەو ژ جهێ خوە ڕابیت شیا خوارنێ بدەستڤە بینیت و شیا ب باشترین شێوە چاڤێ خوە بدەتە هێکێ و گەرم بکەت.

هندەك جاران سونێ د دلێ خوە دا پرسیار دکر کا بۆچی ئێدی ئەڤ وەردەکە ناچیتە دناڤ باخچەی دا، یان ژی بۆچی هەموو گاڤان خوارنێ بۆ سونێ ددانیتە بەر دەرێ هێلینا وێ، هەردیسان هەموو گاڤان زێرەڤانیێ ل وێ و هێکا وێ دکەت. سونێ ئەو وێرەکی نەبوو ڤان پرسیاران ژ هەڤالێ خوە بکەت نەکو ببیتە جهێ تۆڕەبوونا وی.

وەردەکێ کووڤی چ جاران نێزیکی هێلینا سونێ نەدبوو ب تنێ دەمێ پێشکێشکرنا خوارنێ نەبیت، سونێ ژی قەت ژ جهێ خوە نەڕادبوو چونکی نوکە ئەو یا ل سەر هێکێ کورك بووی و نابیت ژ جهێ خوە بلڤیت.

سونێ گەلەك دگەل هێکا خوە ئەوا دایە بەر سینگێ خوە دئاخفت و دگوتێ: "خوەشتڤیا من، وەردەك یێ چوویە سەر گرکەکێ بلند و ئەو یێ تەماشەی جهەکێ دوور دکەت، تو بێژی ئەو نوکە بەری خوە ددەتە چ؟ ئەز دبێژم نوکە ئەو یێ بەرێ خوە ددەتە پشتی برکێ کا چ ل وێرێ هەیە."

هندەك جاران وەردەکی دکرە غارێ و پەڕێن خوە لێکددان، هەلبەت ئەڤ ڕەفتارە بۆ سونێ تشتەکێ سەیر بوو چونکی وی ئەڤ تشتە ل ناڤ باخچەی نەدکرن. پاشی ئەوێ ب دەنگەکێ نزم گوتە هێکێ: "خوەشتڤیا

من، وەردەکێ کووڤی نەشێت پەڕێ خوە یێ ڕاستێ ب شێوەیەکێ باش بلڤینیت. چ پێنەڤێت بەری نوکە تشتەك یێ ب سەرێ وی هاتی. لێ ئەز دبێژم پەڕێ وی یێ چەپێ بهێزترە و باشتر دلڤینیت. ئەڤ چەندە وی ژ وەردەکێن دی یێن ناڤا باخچەی جودا دکەت کو هەموو دشیان هەردوو پەڕێن خوە ب باشی بلڤینن."

ل وی دەمی سونێ چیرۆك و سەرهاتی بۆ هێکا خوە دگوتن، دەمێ وەردەك مژوولی ڤەکرنا پەڕێن خوە دبوو و غاردان ب شێوەیەکێ بازنەیی دکری، هندەك شەڤان ژی وێ ستران بۆ هێکێ دگوتن داکو نەترسیت.

وەردەك یا ل سەر هاتن و چوونا خوە یا بەردەوام بوو و بزاڤ دکرن ب باشی پەڕێن خوە ڤەکەت. وی ئەڤ چەندە بەهرا پتر ل وان شەڤان ئەنجامددا دەمێ شێوەیێ هەیڤێ تەمام دبووی و دبوویە چواردە شەڤی. ئەڤ لڤینێن وی یێن بەردەوام وەکی جۆرە سەمایەکێ بوون، لێ هەواری و ڤێژیێن وی ب سەر چیایی دکەڤتن و دبوونە جهێ نەخوەشیێ بۆ سونێ.

سونێ گوت: "ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ئەڤ وەردەکە یێ کار و ڕەفتارێن سەیر ئەنجامددەت، تو بێژی ئاریشەیا وی چ بیت؟" سونێ ب چ ڕەنگان پرسیارا ئەگەرێ ڤان ڕەفتارێن وی یێن سەیر نەدکر، چونکی وێ نەدڤیا وی بێخیتە د هەلویستەکێ تەنگاڤ دا، زێدەباری هندێ وی ڕۆژانە خوارن بۆ دئینا بەر دەرێ هێلینا وێ.

پشتی تەمامبوونا شێوەیێ هەیڤێ، ئێدی وەردەکێ کووڤی پتر ڕەفتارێن خوە یێن وەکی سەمایێ دووبارە دکرن. سونێ ئێدێ ژبەر ڤان ڕەفتاران یا ئارام نەبوو و هەست ب نیگەرانیێ دکر. ل وی دەمی هێشتا

سونێ ل سەر هێکێ یا ڕوونشتیبوو، پشتی بورینا چەندین شەڤان ل سەر دیاربوونا هەیڤێ ب ڤی شێوەی ئێدی سونێ باشتر هەست ب لێدانێن دلێ تێشکا دناڤ هێکێ دا دکر.

پشتی بەرزەبوونا هەیڤێ ب چەند شەڤێن کێم، دێ تێشکەك ژ وێ هێکێ دەرکەڤیت، لێ سونێ هەست ب نیگەرانییێ دکر چونکی یا ژ وێ ڤە وەردەك ب ڕەفتارێن خوە نەخوەشێی دگەهینتە هێکێ. چەندین شەڤێن دی ژی بورین، هندەك جاران وەردەکێ کووڤی بێدەنگ و ئارام دبوو، لێ سونێ بەردەوام تێبینییا لڤینێن وی یێن سەیر دکر ب تایبەت دەمێ سەما دکری.

شەڤەکێ، وەردەك هەتا سپێدێ نەنڤست و بەردەوام ژ ڤێرێ دچوو وێراهە خو دا بێژی کەسەك یێ ڕادهێلتێ. لێ دەنگێ قەرەبالغا وی ژ دەنگێ غاردانا وی بلندتربوو. سونێ ژی نەدشیا بنڤیت و ئێدی نەشیا ل سەر تۆڕەبوونا خوە زالێ ببیت ژبەر دەنگێ قەرەبالغێ، ژبەر هندێ وێ بڕیار دا ل دور ڤی بابەتی دگەل وەردەکی باخڤیت. سونێ گوت: "ڕاستە وەردەك هەڤالەکێ من یێ هێژا و خوەشتڤی یە، لێ پێدڤیە ئەو دەست ژ ڤان یارییێن نیڤا شەڤێ بەردەت."

ل وێ شەڤێ هەموویێ سونێ نەشیا بنڤیت هەتا وەردەك ژ وێرێ نەچوویە دناڤ برکا ئاڤێ دا، دەمێ ئەو ڤەگەڕیای و ماسیەك دناڤ دمێ وی دا، سونێ بزاڤ کر چاڤێن خوە یێن وەستیایی و خەوگرتی ڤەکەت و دگەل باخڤیت. سونێ سەرێ خوە هەژاند و گوتێ: "هیڤی دکەم دووبارە ڤان

یاریان ئەنجام نەدە، هیڤی دکەم دەستان ژ ڤێ قەرەبالغا هەر شەڤ تو پەیدادکەی بەردە."

وەردەك بێدەنگ ما و چ بەرسڤ نەدانێ چونکی ئەو ب خوە گەلەك یێ وەستیایی بوو.

دیسان سونێ بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە: "تو گەلەك دگەل من یێ هاریکاری و ئەز سوپاسیا تە دکەم و ئەز چ جاران ڤێ چەندێ ژبیرناکەم، لێ ژبیرنەکە نوکە ئەز یا ل سەر هێکەکێ کورك بوویم و ئەز پێدڤی ب سەقایەکێ ئارامم."

دووبارە وەردەك هەر بێدەنگ ما و چ بەرسڤ نەدان، وی هزرکر نوکە سونێ یا وی دشکێنت. ئەو ئێدی نەشیا گوهداریا گازندەیێن وێ بکەت.

ڕۆژەکێ وەردەکی ئەو ژ گۆڕستانا مرنێ قورتال کر، پاشی دژی هەموو باڵندەیێن باخچەی ڕاوەستیا داکو ئەو بشێت بمینتە دناڤ باخچەی دا و نوکە ژی بەردەوام یێ بۆ وێ خوارنێ دئینیت، لێ د سەر ڤێ چەندێ هەموویێ ڕا ئەو نوکە یا گازندەیان ژ وی دکەت.

وەردەکی بەرێ خوە ژ وێ وەرگێڕا و تەماشەی برکا ئاڤێ دکر و کوور چوو د هزران دا، سونێ ژبەر ڤان گازندەیێن خوە یێن بەردەوام شەرم ژ خوە کر، پاشی وێ ب دەنگەکێ نەرم ڤە گوت: "نوکە ئەز یا ب سلامەتم و من پەنجێن ڕەق و دمەکێ بهێز یێ هەی، ئانکو ژ نوکە وێ ڤە ئەز نە نێچیرەکا ب سانەهی مە بۆ گیانەوەران خو بۆ کووشکی ژی، ژبەر ڤێ چەندێ تو دشێی بچیە سەر ڕێکا خوە."

وەردەکێ کووڤی تەماشەی سونێ کر و پەڕێن ستۆیێ وی ڕەقبوون و هەست ب تۆڕەبوونەکا مەزن کر دەمێ وی گوهـ ل ناڤێ کووشکی بووی. وەردەکی ب دەنگەکێ نزم دگەل خوە ئاخفت: "ئەز ب تنێ هەتا دەمێ مەرقاندنا هێکێ دێ مینمە ل ڤێرێ، یان ژی هەتا هەیڤ ڤەدگەڕیتە سەر شێوەیێ خوە یێ بەرێ."

سونێ پرسیار ژێ نەکر کا بۆچی هەتا ژڤانێ مەرقاندنا هێکێ ئەو دێ مینتە ل وێرێ.

ئەو شەڤ ب ئارامی بوری. سونێ گەلەك ب هشیاری تەماشەی وان گوهۆڕینان دکر یێن ب سەر شێوەیێ هەیڤێ دا دهاتن. هەیڤ هێدی هێدی یا تەمام دبیت و دبیتە چواردەشەڤی، پاشی شێوەیێ وێ دووبارە ل کێمیێ دا هەتا ب یەکجاری بەرزەبووی و هندەك شەڤێن گەلەك تاڕی هاتن.

ئەو ژڤانێ سونێ ژ بۆ مەرقاندنا هێکێ دانای گیرۆبوو، لێ لێدانێن دلێ وێ ب شێوەیەکێ بهێزتر یێن لێ ددەن. وەردەکی ژی بەردەوام خوارن بۆ دئینا، ژبەر هندێ وێ هەست ب پەشیمانیێ کر ل سەر وان گازندەیێن وێ بەری نوکە ژ وی کرین و دڤیا داخوازا لێبورینێ ژێ بکەت.

سونێ گوتە وەردەکی: "ئەز دبێژم یا باشتر ئەوە تو پیچەکێ خوە ئارام بکەی، دەمێ تو پەڕێن خوە ڤەدکەی و دلڤینی، هەروەکی دێ بێژی تو یێ سەمایێ دکەی، یان ژی هەروەکی هندێ یە تە دڤێت ب ئازادی بفڕی."

سونێ پەڕێن خوە ڤەکرن و ب شێوەیەکێ ئارام لڤاندن، لێ ئەو نەشیا چ کاران ب پەڕێن خوە بکەت ب تنێ ئەو نەبیت پەڕێن وێ ب ئاخێ

کەڤتن و ئەو جھ کرە تۆز، د ڕاستی دا پەڕێن سونێ بۆ فڕینێ نەبوون بەلکو بۆ جوانی و خۆگەرمگرنێ بوون.

وەردەکێ کووڤی ب دەنگەکێ نزم پرسیار ژێ کر: "ئەز بفڕم!". پاشی وی ب دلەکێ شکەستی ڤە تەماشەی پشتا برکێ کر و گوت: "خۆزی ئەز جارەکا دی ژی شیابام بفڕم."

- "بەلێ پەڕێن تە وەکی پەڕێن باڵندەیێن دی یێن ناڤ باخچەی نینن، پەڕێ تە یێ ڕاستێ لاوازترە."
- " ڕاستە، هۆسا دیارە پەڕێ من یێ ڕاستێ جهێ پێکەنینێ یە چونکی نە وەکی یێ چەپێ یێ بهێزە."

وەردەکی خوە بێدەنگ کر و تەماشەی سونێ دکر دەمێ ئەو ماسیا بچووك دخواری یاکو وی بۆ ئینای، پشتی خوارنا ماسیێ، سونێ دمێ خوە ل ئەردی ددا و د ئاخێ دگەڤزاند و هێدی هێدی لەشێ وێ یێ لاواز بەرەڤ باشیێ دچوو.

وەردەکی پرسیار کر: "نوکە دەم یێ هاتی هێك بمەرقیت، مانە هۆسایە؟"

سونێ بەرسڤا وی دا: "پێدڤی بوو بەری نوکە مەرقیبا چونکی دەمێ وێ گیرۆبوو."

سونێ هەست ب بەختەوەریێ دکر دەمێ ئەو دگەل وەردەکی دڕوونشتە خوار و هەردووکان پێکڤە سحبەت دکرن.  وەردەکی گوت: " ئەگەر هێك مەرقی و باڵندەیەکێ جوان ژێ هاتە دەر، پشتی هینگێ دێ چ ڕوودەت چونکی تو مریشکی."

سونیٚ ژ ڤیٚ ئاخفتنا وی تۆڕەبوو و گوتیٚ: "تو دزانی من ناڤیٚ خوە یێ هەی و من ب خوە یێ بۆ خوە هەلبژارتی". نوکە سونیٚ دڤیا ویٚ نهێنییٚ د دلیٚ خوە دا بینتە دەر یاکو ئەڤە هەیامەکە ویٚ هەلگرتی.

- "ئاها ڕاستە، من ناڤیٚ تە بەری نوکە گوهلێنەبوویە."
- "کەس ناڤیٚ من نزانیت، تە دڤێت بێژییە من سونیٚ؟"
- "سونیٚ؟ تە ئەڤ ناڤە بۆ خوە دانا چونکی تو گەلەك حەز ژ کولیلکێن داران دکەی مانە؟"[2]
- بەلیٚ من ژبەر ڤیٚ چەندیٚ ئەڤ ناڤە بۆ خوە هەلبژارت چونکی ئەز دبێژم چ ناڤێن دی ژبلی ڤیٚ ناڤی ل سەر من ناهێن. هەروەکی تو دزانی کولیلکێن داران زیانیٚ ناگەهیننە کەسیٚ."

ل وی دەمی، وەردەك ب دمیٚ خوە مژوولی شەکرن و ڕێکخستنا پەڕێن خوە بوو و هزر د هندیٚ دا دکر کا بۆچی هندە سونیٚ گرنگییٚ ددەتە ناڤیٚ خوە.

- "کولیلك دایکا هەموو گولانە، ئەو هەناسە ددەن و خوە ل بەر باڕۆڤەییێن دژوار دگرن و حەز ژ تیشکا ڕۆژیٚ یا گەرم دکەن. هەروەسا گولێن سپی دروست دکەن. ژبەر ڤیٚ چەندیٚ ئەگەر کولیلك نەدەن، گول ژی دروست نابن و داروبار شین نابن، کولیلك نهێنییا پەیدابوونا ژیانیٚ نە."
- کولیلك.... ئەڤ ناڤە ژی ل سەر تە دهێت؟"

---

[2] د ڕۆمانیٚ دا ب زمانیٚ ئینگلیزی ناڤیٚ مریشکیٚ (Sprout)ە ئانکو (کولیلك) و ویٚ ئەڤ ناڤە ژبەر کولیلیکێن دارا خەرنۆڤیٚ دانابوو سەر خوە، لیٚ مە ل دەمیٚ وەرگێڕانیٚ ل شوونا ناڤیٚ کولیلك ناڤیٚ (سونیٚ) بۆ ویٚ بکارئینایە.

نوکه سونێ گەلەك یا بەختەوەرە چونکی ل دوماهییێ هەڤالەك بۆ خوە دیت کو ب ناڤێ وێ گازی بکەتێ، ژبەر هندێ وێ بڕیار دا ئێدی گازندەیان ژ ڕەفتارێن وەردەکی یێن سەیر نەکەت. وێ بڕیار دا ئەو دەمێ ئەو ب شەڤێ قەرەبالغێ دکەت خوە ل بەر بگریت.

وەردەکی گوتێ: "هەتا ئەگەر تە ناڤەکێ هۆسا یێ خوەش نەبیت ژی، لێ تو مریشکەکا مەزن و بهاداری، دڤێت تو ڤێ چەندێ بزانی."

سونێ هزرکر ئەو یا گونەهبارە دەمێ وێ گوهـ ل ڤێ چەندێ بووی، تو بێژی ئەو ژ هەژی ناسناڤێ مریشکا بهادار بیت؟ هەلبەت وێ هەست ب شەرمێ دکر چونکی ها دێ نهێنیا وێ دیار بیت. ئەرێ دێ وەردەکێ کووڤی چەند تۆڕە بیت ئەگەر وی ڕاستیا هێکا وێ زانی؟ چ پێنەڤێت ئەو دێ گەلەك تۆڕە بیت.

سونێ دووبارە ڤەگەڕیا ناڤ هێلینا خوە و ل سەر هێکێ ڕوونشت. وێ نەدڤیا بەحسێ ڕاستیا هێکێ بۆ وەردەکی بکەت، هەروەسا وێ نەدڤیا ڤێ ڕاستییێ بۆ کەسێ بێژیت. وێ گوت: "ئەو هێکا ئەز ل سەر کورك بوویم جهگەرا منە و ئەز دێ ب دەستێن خوە وێ مەزن کەم. ئەز یا پشتڕاستم ئەو ژی دێ حەز ژ من کەت."

پاشی وێ هەر زوو بابەت گوهۆڕی و پرسیار ژ وەردەکی کر: "ئەرێ ئەڤە چ ل پەڕێ تە یێ ڕاستێ هاتییە؟ ئەرێ وەردەکا هەڤالا تە یا بەفرین کانێ یە؟"

وەردەكی سەرێ خوە بلند كر و هەموو ئەو خوەشی و بەختەوەریا بەری نوكە ل سەر دێمێ وی ب جارەكێ بەرزەبوو. ب تۆڕەیی ڤە گوتە سونێ: "تو چەوا دوێری بابەتەكێ هۆسا دگەل من ڤەكەی؟"

سونێ مەندەهۆش ما چونكی وێ نەزانی كا بۆچی هۆسا ژ نیشكەكێ ڤە وەردەك تۆڕەبوو، وەردەكی پەڕێن خوە ڤەكرن و سەرێ خوە هەژاند دا بێژی وی كووشك دیت. وی هەست ب نیگەرانییێ كر و هەر یەكسەر ڕابووڤە و چوو ل وان جهان بگەڕیت.

ب ڕاستی ژی مەرەما سونێ ئەو نەبوو ل ڤێ نیڤا شەڤێ هەڤالێ خوە یێ نێزیك تۆڕە بكەت و هەستێن وی بریندار بكەت. سونێ ب دەنگەكێ نزم ڤە گوت: "من هزركر هوون هەردوو پێكڤە یێن ژ ڤێرێ چووین و ئێدی ناڤەگەڕنە ناڤ باخچەی. من دزانی كو باڵندەیێن دی یێن باخچەی حەز ژ تە نەدكر و تو وەكی باڵندەیەكێ بیانی دناڤ وان دا دژیایی و تو بەردەوام یێ ب تنێ بووی."

وەردەكی بەرسڤا گوتنێن وێ نەدا، ژبەر هندێ سونێ ل سەر ئاخفتنێن خوە بەردەوام بوو: "ل ڤێ دوماهیێ تە بۆ خوە هەڤالەكا نوو كو وەردەكەكا بەفرین بوو دیت و د هەمان دەم دا ئەز ژی هەڤالا تەبووم، بەلێ پا ..."

– "من گوتە تە بێدەنگ بە و جارەكا دی ل سەر ڤێ چەندێ نەئاخڤە!"

پشتی گوتنا ڤان ئاخفتنان، وەردەك ب تۆڕەیی ڤە ژ وێرێ چوو بێی ل دوور خوە بزڤڕیت، ژ وێرێ دوور كەڤت، لێ جار جار د ڕێكێ دا دلەنگی

و نەشیا ب دروستاهی ب رێڤە بچیت. سونێ نەزانی کا بۆچی هەڤالێ وێ هۆسا تۆڕەبوو، لێ دیارە ئاخفتنێن وێ تشتەکێ نەخوەش ئینایە بیرا وی.

پشتی بورینا دەمەکێ کێم، دووبارە وەردەك هاتە دەڤ وێ لێ هێشتا نیشانێن تۆڕەبوونێ ل سەر دێمێ وی د دیاربوون، وی گوتە سونێ: "ها وەختە دێ هەیڤ زراڤ بیت، ئەڤ چەندە نیشانا هندێ یە کو ژڤانێ مەرقاندنا هێکێ یێ هاتی."

- "ڕاستە نوکە دەمێ هندێ یە."
- "سونێ، ئەز دزانم تو مریشکەکا زیرەك و بیرتیژی، تو باش دزانی کا دێ چەوا سەرەدەریێ دگەل ڤێ چەندێ کەی، لێ من دڤێت تشتەکی بێژمە تە ئەو ژی هەردەمێ هێك مەرقی، پێدڤیە تو ب زووترین دەم ژ ڤێرێ بچی، لێ نابیت بچیە دناڤ باخچەی جووتیاری دا بەلکو هەرە دەڤ برکێ. هەروەسا ل بیرا تەبیت کو هەردەمێ هەیڤ بچووك دبیت، زکێ کووشکی ژ برسان دا قور قورێ دکەت.

وەردەکی هۆسا دگەل سونێ دئاخفت هەروەکی ئەو یێ خاترا خوە ژ وێ دخوازیت. ئەرێ تو بێژی چونکی ئەو یێ تۆڕەیە لەوڕا دێ ژ ڤێرێ بار کەت؟ ئەرێ بۆچی نوکە ئەو ڤان پێزانین و چیرۆکێن سەیر بۆ وێ دبێژیت؟ وی هندەك تشت گوتنە سونێ کو ب زەحمەتە نوکە ئەو د مەرەما وی بگەهیت.

- "مەرەما تە چیە کو ل ڤی دەمێ هەیڤێ زکێ کووشکی ژ برسان دا قور قورێ دکەت؟"

– نوکه هەموو تشت ب سلامەتی دبورن، لێ ئەز یێ تە ئاگەهدار دکەم ل سەر هەر تشتەکێ نەخوەش کو ڕەنگە ڕووبدەت، دووبارە دێ بێژمەتە نەزڤرە ناڤ باخچەی بەلکو هەرە دەڤ برکێ."
– "بۆچی؟"

وەردەکی بۆ وێ دیارنەکر کا بۆچی نابیت ئەو بزڤریتە ناڤ باخچەی، بەلکو هێدی ژ وێرێ دوور دکەڤت و ب سەر گری کەڤت و تەماشەی جهێن دوور دکر. سونێ گەلەك پۆسیدە بوو دەمێ ناڤێ کووشکی هاتیە گوهێن وێ، لێ پشتی ئەو ل سەر هێکا خوە ڕوونشتیەڤە، هەر یەکسەر کووشك ژ هزرا خوە ئینا دەر.

ئەڤ شەڤە وێ چاڤێن کووشکی یێن زیق دناف تارڕیاتیێ دا نەدیتن، چ پێنەڤێت ئەگەر نوکە کووشك وێ ل ڤێرێ ببینیت دێ ئەو کەڤیتە د ئاریشەیەکا مەزن دا، یان ژی دوور نینە هێکا وێ ژی تووشی مەترسیێ ببیت. ژبەر هندێ وێ بڕیار دا هزرا خوە د ڤان ڕوودانێن نەخوەش دا نەکەت.

تارڕیاتیا شەڤێ پەڕێن خوە ل سەر وی جهی ڤەدان، لێ پاشی سونێ نەشیا ترسا کووشکی ژ دلێ خوە بینتە دەر. دەنگێ کەڤتنا چپکێن خوناڤێ ل سەر بەلگان یان ژی بچووکترین دەنگێ لڤینا گیای دبوو ئەگەرێ لەرزاندنا دلێ وێ، وێ هزر دکر ها کووشك یێ نێزیکی وێ دبیت و چاڤێن وی ل وێرێ دیار بن.

وەردەك ل بەرامبەر مێرگا گولا ڕوونشت و سەرێ خوە کرە دناڤ پەڕێن خوە دا، ئەڤێ چەندێ پتر دلێ سونێ ب ترس دئێخست چونکی

هەکە وەردەك وەکی شەڤێن دی مژوولی فڕین و سەماکرنێ با، ڕەنگە پیچەکێ ترسا وێ ژی کێمتر لێ هاتبا.

ژ نیشکەکێ ڤە هزرەك هاتە د سەرێ وێ دا، ئەرێ تو بێژی ئەوی هەر شەڤ ئەڤ لڤینێن سەیر ژبەر کووشکی کربن؟ بۆ هندێ داکو ئەو کووشکی بترسینیت و خوە نێزیکی وی جهی نەکەت و زیانێ نەگەهینتە وێ و هێکێ.

سونێ بەردەوام تەماشەی هەر چوار لایێن خوە دکر و ب تەمامی ترسێ دلێ وێ داگیر کربوو. وێ د دلێ خوە دا دگوت: "بۆچی وەردەکی دڤێت من بپارێزیت؟ ئەو ڤی کارێ ب مەترسی بۆ هەڤالەکا خوە ئەنجامددەت، نێ ئەز نە وەردەکم هەتا ئەو ڤی کاری ژبەر من بکەت."

د دووڤ دا وێ تەماشەی ئاسمانی کر، ڕۆناهیا ستێران یا کز بوو و هەیڤ ژی یا لاوازبوو و ب هندەك پنییێن ڕەش هاتبوو بەرزەکرن، هەلبەت ئەڤ چەندە نیشانێن بارینا بارانێ نە. سونێ بیرا خوە ل وێ شەڤێ ئینا دەمێ دناڤ چالا مریشکێن مری دا، ل وێ شەڤێ ژی باران دهات.

سونێ ژ جهێ خوە ڕابووڤە و ب ئاوایەکێ وێرەك و چاڤنەترس خوە بەرهەڤکر بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ خوە ب دژی کووشکی. وێ بڕیار دابوو هەر دەمێ کووشك نێزیکی وێ ببیت ئەو ب نینوکێن خوە یێن تیژ و دمێ خوە یێ بهێز چاڤێن وی کورە بکەت و لەشێ وی بریندار بکەت.

سونێ بەرەڤ جهێن تاڕی دچوو و ب باشی تەماشەی واران دکر نەکو کووشکی خوە لێ ڤەشارت بیت، چونکی ئەو ب خوە گیانەوەرەکێ دڕندە و فێلبازە و هەموو گاڤان خوە ل جهێن تاڕی دڤەشێریت و ب چاڤێن خوە

یێن حیز تەماشەی نێچیرا خوە دکەت تاکو دەلیڤەیەکا گونجایی دبینیت خوە تێوەر دکەت. سونێ ب دەنگەکێ بلند گوت: "هێ، وەردەکێ کووڤی، ژ خەو هشیار بە."

وەردەك ب ترس ڤە ژ خەو هشیاربوو و گوت: "چیە، هێك مەرقی؟"

سونێ گوت: "نەخێر، دبیت سپێدەیێ ئەو بمەرقیت، ئەز دبێژم مادەم هندە ژڤانێ مەرقینا وی گیرۆبوو دێ دیکلەکێ جوان و بهێز ژێ دەرکەڤیت."

سونێ دڤیا ل سەر هەستا خوە یا ترسێ زالێ ببیت، ژبەر هندێ وێ ب کەنیەکا دەستکرد کرە کەنی داکو وەردەك چ گومانان ژێ نەبەت کو ئەو یا دترسیت لێ ڤێ بزاڤا وێ چ گوهۆرین پەیدانەکرن. وێ گوت: "ئەز گەلەك یا دترسم، دێ چ روودەت ئەگەر کووشك هات و هێرش کرە سەر مە؟"

وەردەك ل وی دەمی یێ ئارام بوو و چ نیشانێن ترسێ ل دەڤ نەبوون، وی گوت: "باشە، مادەم ژڤانێ مەرقینا وێ سپێدمیە، ئەڤ چەندە تشتەکێ باشە."

وەردەکێ کووڤی ژ جهێ خوە رابووڤە و پەرێن خوە ڤەکرن و تەماشەی هەر چوار رەخێن خوە دکر، ئەڤ رەفتارا وی وەکی رەفتارێن وان دایکان بوو دەمێ هێکێن خوە دپارێزن. ژبەر هندێ سونێ هەست ب پەشیمانیێ کر کو هینگێ وێ خوە ژ لڤینێن وی یێن سەیر تۆرە کربوو.

سونێ گوت: "ئەی وەردەکێ کووڤی، من دڤێت تشتەکی بێژمە تە، من ژمێژە خۆزیەك د دلێ خوە دا هەلگرتبوو، هیڤیا من ئەو بوو ئەز ل سەر هێکەکێ کورك ببم و چیچەلۆکا خوە یا یەکانە ب چاڤێن خوە ببینم، لێ ئەڤ چەندە دناڤ قەفەسکێ دا وەکی خەونەکێ بوو، من نەدڤیا ئێدی چ هێکێن دی بکەم مادەم ئەز هەر نەشێم ل سەر کورك ببم."

- "سونێ تو دایکەکا بهاگران و دلۆڤانی."
- " خو تە ژی هۆسا ب سانەهی و بێ بەرامبەر بۆ من ماسی نەدگرتن."
- " نەخێر، من دڤێت بێژمە تە کو ئەز وەردەکەکێ کووڤی مە و نوکە نەشێم بفڕم، لێ تو مریشکەکا هێککەری، تو مریشکەکا یەکانە و چەلەنگی."
- "باشە ما خو هەکە ئەز یا هێککەر و یەکانە ژی بم، ئەڤ چەندە چ مفای ناگەهینتە من."
- " ڕاستە ئەم دوو گیانەوەرێن ژێك جوداینە و ئەم نەشێن بچینە دناڤ کووراتیا هەستێن هەڤدوو دا، لێ هەر یەك ژ مە ژ لایێ خوە ڤە شانازیێ ب هەڤالینیا یێ دی دبەت، ئەز ب خوە گەلەك حەز ژ تە دکەم و ڕێزێ ل تە دگرم."

سونێ ژ کەیفان دا بێهنا خوە کوور هەلکێشا چونکی ئاخفتنێن وەردەکی کارتێکرنەکا مەزن ل وێ کر. هۆسا دیارە هندەك جاران ئەو ژبەر ئاخفتنێن وەردەکی مەندەهۆش دما، وێ پرسیار کر: "باشە خو هەکە ئەم د هەڤدوو نەگەهین، چەوا ئەڤ چەندە دێ ڕوودەت؟

– "ئەز دزانم تو ژی دایکەکا دلۆڤانی هەر وەکی کولیلکێن داران."

سونیێ بێدەنگ بوو، وێ هزرکر ئێدی پێدڤی هندێ ناکەت ئەو پتر نهێنییا ل سەر هێکا خوە بۆ وەردەکی بێژیت.

وەردەکی بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "ئەز کووشکی باش دنیاسم، ئەو هەر د زکماك دا نێچیرڤان و گوشتخوەرەکێ چەلەنگە و ئەم چ جاران نەشێین ل بەرامبەری وی براوەستین و د شەرێ دگەل وی دا بسەرکەڤین. هندی من کووشکەك د ژیانا خوە دا دیتی ئەو ژ هەموویان مەزنتر و بهێزترە.

ڕاستە نوکە ئەم ب سلامەتین و ژ وی د دوورین لێ ئەم کیڤە بچین، هەر دێ ل دوماهیێ کەڤینە بەر دەستێ وی و دێ مە نێچیر کەت. بەری ئەڤ چەندە ڕووبدەت، پێدڤیە هەر کارەکێ مە هەبیت ئەم ب دوماهی بینین."

سونیێ نەدزانی کو ئاخفتنێن وەردەکی هەموو د ڕاستن لێ وێ دزانی ئەو د گوتنا ئاخفتنێن خوە دا گەلەك یێ ڕژدە و ترانەیان دگەل وێ ناکەت. ژبەر هندێ، هێدی هێدی ترسا وێ زێدەتر لێ دهات. سونیێ باوەر نەدکر کو ئەو ڕۆژێن بەری نوکە هەموو وێ ب سلامەتی یێن بوراندین بێی کو هەست ب ترسا کووشکی بکەت.

وەردەکی گوت: "ئەز گەلەك وەستیام و باوەر ناکەم کووشك ژی پتر خوە ل بەر برسێ بگریت، هیڤیا من ئەوە مەرقینا هێکێ ژ سپێدەیێ زێدەتر ڤەنەکێشیت و هەر سوباهی سپێدەیێ زوو بمەرقیت."

سونێ ب هشیاری تەماشەی وەردەکێ دکر دەمێ ئەو ژ مێرگا گولان دوور دکەڤتی و دگەل خوە دئاخفتی، وێ دزانی تشتەك بەری نوکە دناڤبەرا وەردەکی و کووشکی دا یێ ڕوودایی، لێ ئەو نزانیت کا ئەو چ تشتە و ڤێ چەندێ ئەو نیگەران دکر.

وەردەکی د دلێ خوە دا دگوت: "ئەز نوکە یێ ب سلامەتم، چ پێنەڤێت ئەو ژی هەتا هەیامەکێ دێ خوە گریت هندی هەست ب برسێ نەکەت، ئەز دبێژم هەتا هێك دمەرقیت هەموو تشت دێ ب سلامەتی بورن و ئەز ژی هەتا وی دەمی دێ یێ بەرهەڤ بم."

سونێ نەشیا پتر گوهـ ل ئاخفتنێن وەردەکێ کووڤی ببیت کو ل جهەکێ دووری وێ ڕوونشتبوو و سەرێ خوە کربوو دناڤ پەڕێن خوە دا هەروەك دڤیا بنڤیت.

سونێ پەڕێن خوە ڤەکرن هەروەکی کا چەوا وەردەکی پەڕێن خوە ڤەدکرن دەمێ هزرا خوە د کووشکی دا دکری کا چەوا دێ ل بەرامبەری وی ڕاوەستیت. پاشی وێ هێك بادا داکو لایێ وێ یێ بنی بدەتە بەر سینگێ خوە. سونێ هزر دکر هندی وەردەك ل دەڤ وێ بیت و زێرەڤانیا وێ بکەت، کەس نەشێت زیانێ بگەهینتە وی و هێکا وێ.

پشتی هینگێ بێدەنگیەکا تەمام ل وێرێ پەیدابوو، هەتا دەنگێ لڤینا گیای ژی متبوو، شەڤ هند یا بێدەنگ بوو هەتا بوویە ئەگەر خەوێ چاڤێن سونێ گرتن. هێشتا خەوێ باش چاڤێن وێ نەگرتی، دەنگەك هاتە گوهێن وێ.

"ویق، ویق"

سونیّ چاڤێن خوە ڤەکرن، وێ وەردەکێ کووڤی نەدیت، وێ هەستپێکر ئەڤ ڤێژیا کورت پیچەك مابوو دلێ وێ بقەتینیت.

"ئوی خودا ئەڤە چیە؟"

وەردەکێ کووڤی ب هەموو هێز و شیانێن خوە ڤە د وێ شەڤا تارێ دا و ڤالاٚ ژ ڕۆناهیا هەیڤێ یێ خەباتێ دکەت و بزاڤێ دکەت پەرێن خوە ڤەکەت چونکی گیانەوەرەکێ بهێز لەشێ وێ یێ گرتی و خوە نەدشیا ژ جهێ خوە ڕاببیت. ئێدی چ ڤێژییێن دی ژ وی نەهاتن و دەنگی وی کپ بوو، هۆسا دیارە ملێ وی یێ شکەستی.

لەشێ سونیّ ژ ترسان دا لەرزی و دەم بوو گەوریا وێ هشك ببیت. وێ ب ترس ڤە گوت: "وەردەکێ کووڤی ئەڤە چ ل تە هاتیە؟"

سونیّ ژ جهێ خوە ڕابووڤە و دەرکەڤتە ژ دەرڤە، چاڤێن خوە باش ڤەکرن و پەرێن خوە ڤەکرن، لێ چ دبینیت؟ دیمەنێ وەردەکێ کووڤی دناڤ دەڤێ کووشکی دا ئەو د جهـ دا هشك کر، پیچەك مابوو دلێ وێ ژ لێدانێ براوەستیت. چاڤێن کووشکی یێن حیز ئاماژە ددانە وێ کو ب چ ڕەنگان خوە نێزیکی وی نەکەت و ل دوور خوە ژی نەزڤڕیت. ب ڕاستی ژی هەلویستەکێ زێدە گران و نەخوەشە. سونیّ نەشێت ب پەنج و دمێ خوە شەرێ وی بکەت. سونیّ ژ ترسان دا د جهێ خوە دا دلەزری و چ ژ دەستێن وێ نەدهات بۆ هەڤالێ خوە بکەت ب تنێ ئەو نەبیت تەماشەی دیمەنێ وی یێ دوماهیێ بکەت کو دناڤ دەڤێ کووشکی دا بوو و هێدی هێدی ژ پێش چاڤێن وێ بەرزە دبوو.

کووشك دناڤ تارپاتیا دارستانێ دا بەرزەبوو، هەر زوو جارەکا دی بێدەنگیێ پەرێن خوە ب سەر وی جهی دادان، سەرەرای ب دوماهی هاتنا ژیانا خوەشتڤیترین کەس ل بەر دلێ وێ، لێ ئەو جه یێ ئارام و بێدەنگ بوو، داروبار، هەیڤ و ستێر، هەموو تشتێن دی یێن ل وی جهی د ئارام بوون. هۆسا خۆیا دبوو هەروەکی چ تشت ڕوونەداین.

سونێ ل دووڤ کووشکی کره غارێ، لێ ژبلی تارپاتیێ چ تشتێ دی وێ نەددیت. ل وان جهان هەموویان گەریا یێ کو وەردەك بەری هینگێ لێ ڕوونشتی بەلکو شوونوارەکێ وی ل دووڤ خوە هێلایی ببینیت خوە هەکە پەرەکێ وی یان هەر تشتەکێ دی بیت.

ب ڕاستی هەلویستەکێ نەخوەشە، وەردەکێ کووڤی هاتە نێچیر کرن و ئەو نەشیا وی ڕزگار بکەت. سونێ نەشیا ڕۆندکێن خوە بڕاوەستینیت و کەربێن وێ ژ وێ ب خوە ڤەبوون چونکی نەشیا هەڤالێ خوە ڕزگار بکەت. نوکە ئەو گەلەك یا خەمگینە ژبەر ژ دەستدانا وی.

هەر ژ وی دەمێ مریشکێ باخچە بجه هێلای، بەردەوام چاڤێن کووشکی یێن حیز و ب ترس ل سەر وێ بوون و بەردەوام ب دووڤ وێ ڤە بوو. دەمێ ئەو دناڤ باخچەی دا یان ل بن دارا خەرنۆفێ ژی دنڤستی، وەردەکی بەردەوام زێرەڤانیا وێ دکر، لێ مێرگا گولان بۆ وێ نە جهەکێ ئارام بوو.

وێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەو هەر شەڤ هەتا سپێدەیێ دما هشیار داکو زێرەڤانیا من و هێکێ بکەت و مە ژ کووشکی بپارێزیت. خۆزی ئەو

ئەڤ شەڤە ژی وەکی شەڤێن دی مابا هشیار. بۆچی وی نەدکرە هەوار داکو گیانەوەرەك د هەوارا وی هاتبا؟ هەی وەردەکێ بەخت ڕەش!"

هەلبەت ئەو گەلەك یێ وەستیایی بوو ژبەر هندێ د خەو چووبوو، سونێ گەلەك دترسیا و لەشێ وێ دلەرزی، پێدڤی بوو ئەو نوکە مریبا نەك وەردەك، لێ مخابن هەموو تشت زوو ب دوماهی هاتن.

ڕۆژا پاشتر، ڕۆژەکا نوو هەلات.

ڕۆژ هەلات و تیشکێن خوە ل وان جهان بەلاڤکرن یێن بەری نوکە وەردەك لێ دڕوونشتە خوار، لێ ئەڤرۆکە وەردەك ل وێرێ نینە سەرێ خوە بۆ تیشکێن ڕۆژێ بلند بکەت و پەڕێن خوە ڤەکەت. سونێ بڕیار دا ئەو چ جاران وەردەکێ ژبیر نەکەت و هەتا هەتا وی دناڤ دلێ خوە دا بهێلتە ساخ.

سونێ وەك خاترخواستنەك ژ هەڤالێ خوە یێ خوەشتڤی، چوو جهێ وی ل بن تیشکێن ڕۆژێ یێن گەرم و پەڕێن خوە ڤەکرن. ژ نیشکەکێ ڤە بیرا وێ ل هێکا وێ هات ئەوا وێ ب شەڤێ ب تنێ هێلایە د هێلینێ دا، ئەو بلەز بەرەڤ هێلینێ ڤە چوو، ئەو تشتێ وێ ب چاڤێن خوە ددیتی باوەر نەدکر.

- "ئای خودێ، ئەڤە چیە ئەز ب چاڤێن خوە دبینم!"

هێکا وێ مەرقی بوو و تێشکەکا جوان ژێ هاتبوو دەرێ، تیڤکلێ هێکێ ب خوە هاتبوو شکاندن و ئەو ژێ دەرکەڤتبوو. ئەڤە چ دیمەنەکێ هۆسا جوانە کو گیاندارەکێ بچووك و جوان کو ب هندەك پەڕێن نەرم و نازك هاتبوو نخافتن ژێ هاتیە دەر و ل سەر ئەردی ڕوونشتیە و بزاڤێ دکەت خوە بلڤینیت.

سونێ د جهێ خوه دا ڕاوەستیا. وێ ب هیڤیەکا مەزن ڤە تەماشەی ڤی گیانداریێ جوان و بێگونەهـ دکر، بەری نوکە وێ دزانی کو گیاندارەك یێ دناڤ وێ هێکێ دا گەشە دکەت، لێ ئەو تشتێ نوکە ئەو دبینیت وەکی خەونەکێ یە. سەرەڕای کو هەموو ئەندامێن وی گەلەك د بچووك و نازك بوون، دوو چاڤێن بچووك، دوو پەڕێن بچووك، دوو پێن بچووك، لێ هەموو ئەندامێن لەشی وی  گەلەك د جوان و بالکێش بوون.

سونێ گوتێ: "ئەڤە تو هاتیە سەر دنیایێ خوەشتڤیێ من."

سونێ ب پەڕێن خوە ئەو باڵندەیێ بچووك یێ ژ نوو ژ هێکێ دەرکەڤتی هەلگرت و دا بەر سینگێ خوە، ب ڕاستی ژی ئەو باڵندەیەکێ ڕاستەقینە و گەرم بوو. ل وێ سپێدەیێ، بەرێ سونێ لێ بوو جارەکا دی وەردەکێن باخچەی بەرەڤ برکێ دچوون و دیمەنێن وێ چەندێ وەکی یێن ڕۆژێن بەری هینگێ بوون هەروەکی چ تشت نەهاتیە گوهۆرین. لێ بۆ سونێ ئەو چەندە ڕۆژەکا نوو بوو.

بەردەوام تشتەك ل ڤێ جیهانێ ڕوودەدەت، گیاندارەك دمریت و د هەمان دەم دا یەکێ دی ژ دایك دبیت، ئانکو  یەك خاترا خوە ژ ڤێ جیهانێ دخوازیت و یەکێ دی دهێتە دیدارا وێ، ئەڤ چەندە هندێ دگەهینیت نابیت ئەم هەتا هەتایێ ب خەم بکەڤین.

سونێ تێشکا خوە یا ڕەنگ قەهوایی یا ژ نوو پەیدابوویی دا ب دووڤ خوەڤە و ب دفن بلندی و ژ خوە ڕازی بەرەڤ باخچەی جووتیاری دا ڕێ.

وەردەکێ کووڤی داخواز ژ وێ کربوو هەر دەمێ هێك دمەرقیت پێدڤیە یەکسەر ئەو وێ مێرگێ بجهـ بهێلیت. ژبەرکو وی دڤیا تێشکا نوو ب سلامەتی بهێتە سەر دونیایی و ئەو و سونێ هەردوو ب سلامەتی بژین، وی بەردەم زێرەڤانی ل وان دکر و هەتا سپێدێ دما هشیار چونکی وی دزانی ڕۆژ بۆ ڕۆژێ برسا کووشکی یا زێدەتر لێ دهێت و دوور نینە ژ نیشکەکێ ڤە هێرشێ بکەتە سەر وان.

ب ڕاستی ئەو هەڤالەکێ وەفادار و دلسۆز بوو، وی بەردەوام خوارن بۆ سونێ دئینا بەر دەرێ هێلینا وێ داکو ئەو ل سەر هێکێ بمینیت و ژ جهێ خوە نەڕابیت و زیان نەگەهیتە هێکێ.

نوکە پشتی وەردەکی خوە کریە قوربان ژ بۆ پاراستنا وان، پێدڤیە ئەو ڤی جهێ مەترسیدار بجهـ بهێلن چونکی دوور نینە جارەکا دی کووشك هێرشێ بکەتە سەر وان دەمێ برسی دبیت. دەمێ سونێ نێزیکی باخچەی بووی، یەکسەر چاڤێ سەیێ پیر ڤێکەڤت کو پیچەك چاڤێن وی کەڤتبوونە سەر یەك و خوە ل بەر تیشکا ڕۆژێ یا گەرم درێژ کربوو و ل بەر بوو بنڤیت.

یەکسەر سە لێ ڕەوی و گوتێ: "سەحکەنێ، دیسان ئەڤە کی جارەکا دی زڤڕی ناڤ باخچەی!"

ل وی دەمی، مریشك یەکسەر ژ جهێ خوە یێ دناڤ کۆلکی دا ڕابووڤە خوە هاڤێتە سەر دیواری و ل دووڤ دەنگێ ڕەوینا سەی هات، ل

دووڤ دا شەش چیچەلۆکێن زەر ژی کەڤتنە پشت وێ. ئەڤە ئەو چیچەلۆك بوون یێن وێ ئینایینە سەر دونیایێ، لەشێ وان هەموو یێ زەر بوو و خوە پنیەکا ڕەش یان قەهوایی ژی ل سەر نەبوو. مریشکێ خوە تەحل و ترش کر و گوت: "ئۆهـ! ڤێجا دیسان ئەڤە توی؟"

پاشی وێ دەست ب چیپ چیپێ کر داکو هەڤالێ وێ، دیکل، د هەوارا وێ بهێت چونکی ئەو هێشتا د ژوور ڤە بوو حەزنەدکر بهێتە بەر تیشکا ڕۆژێ یا دژوار دناڤ باخچەی دا.

ل وی دەمی سونێ چووبوو بن دارا خەرنۆفێ و بێهنا خوە ل وێرێ ڤەددا، لێ تێشکا وێ یا بچووك پیچەکێ ژ وێ دوور کەڤتبوو، ژبەرکو ئەو ژ نوو یا پەیدابووی و پێن وێ هێشتا هند ب هێز نینن خوە باش ل سەر بگریت، ژبەر هندێ چەندین جاران کەڤتە سەر ئەردی، لێ دگەل هندێ شیا ل دوماهیێ خوە بگەهینتە دناڤ باخچەی دا.

سە ل دور تێشکا نوو پەیدابووی زڤڕی و بێهن دکرێ و ڤێ چەندێ دلێ سونێ ب گومان ئێخست نەکو ئەو زیانێ بگەهینتە وێ، هەروەسا د هەمان دەم دا مریشکا باخچەی هێشتا یا بەردەوام بوو ل سەر چیپ چیپا خوە و گوت: "چەوا ئەڤ مریشکا نەساخ شیا هێکان بکەت و ل سەر کورك ببیت؟ ئەز قەت ڤێ چەندێ باوەرناکەم."

چیچەلۆکێن بچووك ژی کو ل پشت دایکا خوە د ڕاوەستیایی بوون، ژ نوو فێری ئاخفتنێ ببوون و هەموویان پێکڤە پشتی دایکا خوە گوت: "چەوا ئەڤ مریشکا نەساخ شیا هێکان بکەت و ل سەر کورك ببیت؟ ئەز قەت ڤێ چەندێ باوەرناکەم."

مریشکێ گوت: "بێدەنگ بن، چێنابیت هوون ئاخفتنێن هۆسا فێر ببن."

چیچەلۆکان ژی لێ ڤەگێڕا: "بێدەنگ بن، چێنابیت هوون ئاخفتنێن هۆسا فێر ببن."

مریشك: "ئۆی خودێ ئەڤە چیە، هێشتا من تشتەك نەگوتی هوون دێ د دووڤ من ڕا ڤەگێڕن."

چیچەلۆك: "ئوی خودێ ....."

هێشتا چیچەلۆکا ئاخفتنا دایکا خوە ب تەمامی نەڤەگێڕای، دایکا وان بلەز ئاخفتنا وان بڕی و گوت: "نوکە دەمێ هندێ یێ هاتی ئەم بچین خوارنەکا سڤك و ب تام بخۆین."

هەر یەکسەر چیچەلۆك ژی ب دووڤ وێ کەڤتن و هەمان ئاخفتنا وێ دووبارە کر.

سونێ ب گڕنژین ڤە تەماشەی وان چیچەلۆکێن زەر دکر، ب ڕاستی ئەو د بچووك و جوان بوون و پەڕێن وان یێن زەر و بچووك ژی گەلەك د بالکێش بوون. ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو چیچەلۆکان هۆسا ژ نێزیك ڤە دبینیت. وێ هزر دکر پشتی ماوەیەکێ کورت ڕەنگێ چیچەلۆکا وێ ژی دێ زەر بیت.

سونێ ل بن دارا خەرنۆفێ ڕوونشتە خوارێ و چیچەلۆك دانا بەر سینگێ خوە و پەڕێن خوە ب سەردا ئینان و بڕیار دا ب چ ڕەنگان ژ وێرێ دوور نەکەڤیت هەتا چیچەلۆکا وێ مەزن دبیت، بۆ وێ یا گرنگ نینە کا

دێ باڵندەیێن دی یێن باخچەی چ بێژنە وێ یان یارییێن خوە پێ بکەن چونکی هەر چ نەبیت ئەڤ چەندە ژ هندێ باشترە کووشك وێ و چیچەلۆکا وێ بخۆت.

سەیێ پیر سەرێ خوە بلند کر و ب تۆڕەیی ڤە گوت: "ئەڤە چ قەرەبالغە ل ڤێرێ؟"

دیکلی ژی زێدەتر نەشیا خوە ل بەر قەرەبالغا دەنگێ وان بگریت ژبەر هندێ ژ کۆلکی هاتە دەر داکو بزانیت کا چ ڕوودایە، دەمێ ئەو هاتیە ژ دەرڤە، ب دیتنا سونێ گەلەك مەندەهۆش ما و چەندین جاران ل دور وێ زڤڕی، وی قەت باوەرنەدکر هێشتا ئەو یا مایە ساخ.

سەیێ پیر چوو بن گوهێ دیکلی و تشتەك گوتێ، هۆسا دیارە ئەو ئاخفتن یا ب دلێ وی نەبوو چونکی هەر یەکسەر ناڤ چاڤێن وی تێکچوون، پاشی گوتە سەی: "ئەڤ چەندە ڕاستە؟ باشە کا نیشا من بدە چونکی من دڤێت ببینم."

سونێ هەست ب نیگەرانییێ کر چونکی وێ نەدڤیا داخوازا دیکلی بجهـ بینیت و چیچەلۆکا خوە نیشا وی بدەت نەکو زیانێ بگەهینتێ، ژبەر هندێ وێ خوە بێدەنگ کر و بەرسڤا وی نەدا.

– " من گوتە تە کا وێ چیچەلۆکا وەردەکێ نیشا من بدە"

پشتی دووبارەکرنا ڤێ داخوازیێ، دیکل گەلەك تۆڕەبوو و پەڕێن سەر ملێن وی ڕەق و بلند بوون، سونێ مەندەهۆش ما و پیچەکێ بەرەڤ پێشڤە چوو، ئەو ژی ژبەر هندێ بوو چونکی دیکلی گوتێ چیچەلۆکا وەردەکێ نیشا من بدە.

پشتی هینگێ مریشك و چیچەلۆكێن خوە هەموو هاتن و ل دورماندوری سونێ ڕاوەستیان، لێ سونێ دیسان خوە ژ جهی٘خوە نەلڤی و هێشتا چیچەلۆکا وێ ژی ل بەر سینگێ وێ بوو. ل وی دەمی زنجیرەکا سەرهاتیان هاتنە بیرا وێ: ئەو هێکا دناڤ مێرگا گولان دا، وەردەکێ کووڤی و ئینانا ماسیان بۆ وێ و دەنگێ ڤێژیێ دناڤ مێرگێ دا و کووشك و پەڕێن ڕەنگ ڤەهوایێ ڤەبی... هتد. لێ پەیڤا چیچەلۆکا وەردەکێ بۆ وێ یا سەیر بوو چونکی هەتا وی دەمی ژی سونێ نەدزانی کا ئەو هێکا ئەو چیچەلۆکە ژێ هاتیە دەر یا کیژ باڵندەیە.

سونێ تەماشەی چیچەلۆکا ل بەر سینگێ خوە کر دیت پێن وی ب پیستەکی هاتینە نخافتن، هەروەسا تەماشەی دمێ وی یێ پەحن و گرۆڤر دکر و ل دەمێ ڕێڤەچوونێ ژی دلەنگی. لێ سونێ هزردکر ئەڤ چەندە هەموو ب تنێ ژبەر هندێ یە چونکی ئەو هێشتا چیچەلۆکەکا بچووکە و مەزن نەبوویە.

سونێ هەست ب گێژبوونێ کر هەروەکی کا چەوا بەری نوکە ژی جارەکێ ئەو گێژ ببوو دەمێ وەردەکەکا باخچەی لەڤەك دانایە وێ پشتی کو بزاڤ کری بچیتە سەر سێنیکا وێ یا خوارنێ و پیچەکا خوارنێ دگەل بخۆت.

نوکە هێدی هێدی سونێ یا د هەموو وان ڕوودانان دگەهیت یێن بەری نوکە ئەو تێنەگەهشتی یان ژی هەما هەر وێ هزرا خوە تێدا نەکری.

دەمێ یەکەم ڕۆژا ئەو چوویە دناڤ مێرگا گولان دا، وێ گوهـ ل دەنگێ ڤێژیەکێ بوو، ل دەستپێکێ وێ هزرکر ئەڤ ڤێژیە ژ وەردەکێ کووڤی دەرکەڤت، بەلێ دیارە ئەو دەنگێ وەردەکا بەفرین بوو و ئەو هێکا پشتی هینگێ ل وێرێ ژی دیتی هەر هێکا وێ بوو.

پشتی هینگێ وەردەکێ کووڤی ڕۆژانە دهاتە وی جهی یێ سونێ ل سەر هێکێ کورك بووی. وی دزانی کو هێك دێ مەرڤیت و دێ وەردەکەکا بچووك یا جوان ژێ دەرکەڤیت، وی گیانی خوە کرە قوربانی داکو وەردەکا وی یا بچووك ب سلامەتی بهێتە سەر دنیایێ.

هۆسا دیارە ل وێ شەڤێ ئەو گەلەك یێ وەستیایی بوو، ژبەر هندێ ئەو نڤست و خوە بۆ ڤۆربانیکرنێ ئامادەکربوو چونکی وی دزانی وێ شەڤێ کووشك دێ گەلەك برسی بیت و دێ هێرشێ کەتە سەر مریشکێ و چیچەلۆکێ، لێ وی خوە کرە قوربان داکو ژیانا وان هەردووکان یا ب سلامەت بیت. ڕەنگە دبیت ژبەر هندێ بیت کو وی داخواز ژ سونێ کر بەرەڤ برکا ئاڤێ بچیت و ب چ ڕەنگان نەچیتە ناڤ باخچەی جووتیاری.

نوکە سونێ هەست ب خەمەکا مەزن دکەت و لەشێ وێ یێ ڕەقبووی، نوکە ژی جارەکا دی دلێ وێ پرت پرتبوو هەروەکی کا چەوا ئەو ڕۆژا وێ دوماهیك هێکا خوە کری هۆسا دلێ وێ نەخوەش بوو، هەلبەت لەشێ مرۆڤی هەست ب ئێشانەکا مەزن دکەت دەمێ مرۆڤ یێ خەمگین و پۆسیدە بیت.

وەردەکا بچووك پیچەکێ سەرێ خوە ژ بن پەڕێن سونێ ئینا دەرێ و تەماشەی ژ دەرڤە کر، هەرچەندە سونێ پیچەکێ دترسیا لێ ئێدی ئەو

نەبوو ڕێگر ل هەمبەر وەردەکا بچووك کو هەر دناڤ پەڕێن خوە دا بڤەشێریت. ژبەر هندێ وەردەك ژی ژ بن پەڕێن وێ هاتە ژ دەرڤە و چوو دگەل چیچەلۆکێن دی یێن بچووك.

هەرچەندە ڕەنگێ وی قەهوائیەکێ تاری بوو و ڕەنگێ چیچەلۆکێن دی یێ زەر بوو، لێ هەموو بوونە هەڤالێن یەك و ب دلەکێ خوەش یاری پێکڤە کرن.

– "هەی ژارێ، ئەو هزر دکەت ئەو چیچەلۆکەکا مریشکێ یا بچووکە."

سەی ل سونێ کرە هەوار: "دێ سەحکێ! تو نوکە دبینی؟"

ل وی دەمی، دیکل و مریشکێ یاری ب سونێ دکرن و گوتێ: "مریشکا نەساخ تو چەوا دشێی هێکا بکەی! یا باشتر ئەو بوو تو فروتبایە خوەدانێ خوارنگەهەکێ و وی ژی گوشتێ تە قەلاند با، باشتر بوو ژ هندێ نوکە تو بزڤڕیە ناڤ باخچەی و ببیە پێترانك."

سونێ بەرێ خوە دا مریشکێ و ناڤ چاڤێن خوە لێ کرنە گرێ. پاشی دیکلی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە و گوت: "بۆ تە جهێ سەربلندیێ بوو هەکە نوکە تو ل سەر سێنیکەکا برنجێ بای ل بەر کەسەکێ برسی، باشە ما تو شەرم ناکەی تو ل سەر هێکا نفشەکێ دی یێ باڵندەیان کورك ببی؟"

سەی ژی ترانە پێکرن و گوتێ: "هەتا نوکە من نەدیتیە مریشکەك ل سەر هێکا وەردەکەکێ کورك ببیت، ئاخ بۆ ڤی کارێ شەرمزار."

ل وی دەمی، دیکل ب خوە یێ تۆڕەبوو و دلێ وی یێ نەخوەش بوو، لێ دەمێ وی گوهـ ل ترانێن سەی بووی، پتر تۆڕەبوو و ڕاهێلایێ و دا بەر

دمان هەتا سە ڕەڤی و چوویە د کۆلکێ خوە ڤە. ژبەر تۆڕەییێ، پەڕێن دیکلی هەموو ڕەپ ڕاوەستیان، پاشی وی گوتە مریشکێ: "تو مریشکەکا ڤاڕێبوویی و تە دڤێت ژ ڕەگەزێ خوە دوور بکەڤی."

پاشی وی بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "تو مریشکەکا تەمساڕی چونکی تو بوویە ئەگەر ڕەگەزێ مە دناڤ باڵندەیێن دی دا هەست ب شەرمزاریێ بکەت. تو چەوا وێرایی ڤێ هەتکبەریا خوە بینیە دناڤ باخچەی دا؟ ئەم ژ نەڤیێن هەتاڤێ نە و مە ڕەگەزێ خوە یێ هەی، تە زانی هەی مریشکا گێژ و دەبەنگ."

دیکل ب تۆڕەیی و دەڤ گازندە ڤە دناڤ باخچەی دا دهات و دچوو هزرێن خوە دکرن کا چ بکەت. جار جارا ژی ل جهێ خوە دڕاوەستیا و ب ناڤ چاڤ گرێ ڤە سەحدکرە سونێ. ل دوماهیێ گوت: "ئەڤ چەندە قەت د سەرێ من دا ناچیت!"

سونێ ژی یا دامایی بوو هزرێن خوە دکرن، هەرچەندە سەرێ وێ ژی ژبەر هزران یێ گێژبووی، لێ دگەل هندێ وێ هەست ب هەموو تشتان دکر ب تنێ ئەو نەبیت کو ب چ ڕەنگان وێ هەست ب شەرمزاریێ نەکر کو ئەو ل سەر هێکا وەردەکێ یا کورك بووی.

خۆزیا وێ یا سەرەکی ئەو بوو ب زووترین دەم هێکا وێ بمەرقیت و چیچەلۆکا وێ ژێ دەرکەڤیت. هەر ل وێ ڕۆژا ئەو ل سەر هێکێ ڕوونشتیە خوارێ، ژ نوو وێ هەست ب هەبوونا خوە وەك مریشك کر. چ جاران وێ گرنگی نەددا هندێ کا ئەڤ هێکە یا کیژ باڵندەیە.

وێ د دلێ خوه دا دگوت: "ڕاسته ئەڤ هێکه دەرکەڤت یا وەردەکێ و نوکه وەردەکەکا بچووك و جوان یا ژێ هاتیه دەر، لێ ئەڤ چەندە نەیا گرنگە، چونکی یا گرنگ ئەوە ئەڤ وەردەکا بچووك هزر دکەت ئەز دایکا وێ مە."

دنیا بوو شەڤ و وەردەکێن باخچەی ژناڤ برکێ زڤڕین، پشتی گەهشتنا وان هەر یەکسەر دیکلی کۆمبوونەك دگەل وان کر داکو چارەسەریەکێ بۆ ئاریشەیا مریشکا گەمژە و وەردەکا وێ یا بچووك ببینن. دیکلی دڤیا هەر زوو خوە ژ ڤێ ئاریشەیێ قورتال بکەت و وان ژناڤ خوە بکەنە دەر، لێ ژ نیشکەکێ ڤە وان گوهـ ل دەنگێ خوەدانێن مالێ بوو. ژنا جووتیاری گوتە هەڤژینێ خوە: "تەماشەی مریشکا هە بکە."

جووتیاری گوت: "ئەڤە ئەو مریشکە، چەند یا قەلەو و جوانە، ئەو ژ کیڤە هاتیە؟". جووتیار ب دیتنا مریشکێ گەلەك کەیفخوەش بوو و گوتە هەڤژینا خوە: "سەحکێ وەردەکەك ژی یا دگەل وێ، یا باشترە ئەم جهەکی دناڤ باخچەی دا بۆ وان پەیدا بکەین."

هەرچەندە دیکل ب گوهلێبوونا ڤان ئاخفتنان گەلەك تۆڕەبوو، لێ هۆسا دیارە ژ سحبەتێن وان کو سونێ و وەردەکا خوە بەختەکێ باش ئەڤ جارە دێ هەبیت و دێ جهەك بۆ وان دناڤ باخچەی دا هێتە تەرخانکرن.

بەری نوکە ژی دیکلی خوە کربوو مەزنێ هەموو گیانەوەرێن دناڤ باخچەی دا و بڕیار هەموو ب دەستێ وی بوون، نوکە ژی بەری ئەو بڕیارێ ل سەر مانا وان بدەت، دڤیا بەری هەموو تشتان مەزناهیا خوە بۆ

وان دیار بکەت، ژبەر هندێ وی خوە هاڤێتە سەر هێلینا خوە کو ل سەر جهەکێ بلند بوو.

وی دیت مریشکا ب ڕەخ وی ڤە یا دگەل چیچەلۆکێن خوە ڕوونشتیە، وەردەك ژی هەموو یێ ل بەر سینگێ وی ب ڕێز ڕاوەستیاینە، سونێ ژی یا ل بەر لێڤا دەرگەهی ڕاوەستیایی و وەردەکا خوە یا کریە د کوشا خوە دا، سەیێ پیر ژی یێ د دەرگەهێ کۆلکی دا ڕاوەستیایی و گوهداریا دیکلی دکەت.

دیکلی دەست ب ئاخفتنێ کر: "هەروەکی هوون هەموو ژی دزانن هاتنا مریشکێ بۆ ڤێرە ئاریشەیەکا مەزنە، ڤێ مریشکێ تێشکەکا وەردەکێ یا دگەل خوە ئینای و دڤێت دگەل مە دناڤ باخچەی دا بژیت. وەك مەزنێ ڤی باخچەی ئەز دشیام بڕیارەکا یەکلا ژ دەڤ خوە بدەم لێ من دڤیا ئەز بۆچوونا هەوە وەردەکان ژی وەربگرم چونکی ڤێ ئاریشەیێ پەیوەندی ب مە و هەوە هەردووکان ڤە هەیە. هوون دبێژن ئەم چ ل ڤێ مریشکا دەبەنگ بکەین؟ پاشی چ ل ڤێ وەردەکا بچووك ژی بکەین؟"

بەری هەموو گیانەوەران، مریشکا هەڤالا وی دەست ب ئاخفتنێ کر: "دناڤ ڤی کۆلکی دا ب تنێ جهێ یەك مریشك هەیە ئەو ژی ئەزم و من شەش چیچەلۆك هەنە و ئەڤ جهە تێرا مە ب خوە ناکەت. هەرچەندە ئەز گەلەك زەحمەتێ ب پەروەردەکرنا چیچەلۆکێن خوە ڤە دبینم لێ ژ نوکە وێڤە دێ پتر زەحمەتێ بەم چونکی بەردەوام چیچەلۆکێن من دێ پرسیارێ ژ من کەن کا بۆچی وەردەکەکا بچووك دبێژتە مریشکەکێ دادێ؟ ئەرێ بۆچی ئەو وەردەك وەکی مە نینە؟ دوور نینە هندەك زارۆکێن من

ل شوینا دەنگێ مریشکان فێری دەنگی وەردەکان ببن، ژبەر هندێ ئەز ڕازی نابم چیچەلۆکێن خوە د هندەك کاودانێن هۆسا دا پەروەردە بکەم، لەورا یا باشترە ب زووترین دەم مریشك و وەردەکا خوە ژ ڤێرە بچن."

سە ڕەوی و گوت: "هەلبەت ئەڤ چەندە هەموو ڕاستە، دڤێت ژبیر نەکەین کو پاراستنا ڕێسایێن ژیانێ ب سەر هەموو تشتان دکەڤن."

سونێ دڤیا ئارامیا کۆمبوونێ بپارێزیت و ل دەلیڤەیەکێ دگەڕیا کو بشێت ڤێ کۆمبوونێ د بەرژوەندیا خوە دا بکاربینیت لەورا خوە بێدەنگ کربوو، هەروەسا داکو چیچەلۆکا وێ یا بچووك ژی ژ بن پەڕێن وێ دەرنەکەڤیت و بکەڤیتە پێش چاڤێن باڵندەیێن دی، وێ ئەو کربوو دناڤ پەڕێن خوە دا و ڤەشارت بوو.

سەرکێشێ وەردەکان ب دەنگەکێ بلند گوت: "باشە، ئەڤ وەردەکە ژ نوو یا ژ هێکێ دەرکەڤتی و ئەگەر ئەم وێ بکەینە دەر ڕەنگە هەر یەکسەر بمریت. ئەم دشێن دناڤ خوە دا جهەکی بدەینێ و بپارێزین چونکی ئەو ب خوە ژ ڕەگەزێ مەیە و ئەم دشێین چاڤێ خوە بدەینێ. وەردەکێ کووڤی و هەڤالا وی یا بەفرین کەڤتنە بەر هێرشێن کووشکی و بوونە نێچیرا دەڤێ وی. نوکە ڕەگەزێ مە یێ ل هەمبەر مەترسیا ژناڤچوونێ و ئەڤە دەمەکێ درێژە مە چ نەڤیێن خوە یێن نوو نەدیتینە. بلا بۆ هەوە یا دیار بیت ژی کو ل ڤان ڕۆژێن سەخت ئێدی بۆ وەردەکان یا ب سانەهی نینە هێکان بکەن ول سەر کورك ببن."

مریشکێ ب تۆڕەیی ڤە ئاخفتنا وی بڕی و گوتێ: "ئەڤە چ بێ مێشکییە، تو چ دبێژی؟ چەوا ڕەگەزێ هەوە کەڤتیە بەر هێرشا

ژناڤچوونێ ل دەمەکی باخچە یێ پڕە ژ وەردەکان؟ وەکی دی ژی کەس نزانیت کا ئەو وەردەك ب سەر کیژ ڕەگەزێ باڵندەیان ڤەیە و هەتا نوکە ئەو ب خوە ژی نزانیت ئەو وەردەکە.

لێ سەرکێشێ وەردەکان ژ ئاخفتنا خوە نەهاتە خوار و گوت: "دڤێت کەس ژ مە خوە ژ وێ ڕاستیێ نەخاپینیت، ڕاستە مریشك ل سەر هێکێ یا کورك بووی و ئەو وەردەکە ئینایە سەر دنیایێ، لێ کەس نەشێت ڕێکێ لێ بگریت کو نەچیتە دناڤ ئاڤێ دا مەلەڤانیان بکەت و نێچیرا ماسیان بکەت. ئەز ب خوە دێ ب ڤی کاری ڕابم و یێ بەرهەڤم هەموو تشتان نیشا وی بدەم و ب چ ڕەنگان ئەم وی ژ باخچەی ناکەینە دەرێ و ئەڤ چەندە بڕیارا مە یا دوماهیێ یە.

دووبارە مریشکێ ئاخفتنا وی بڕی و گوت: "نەخێر، ب چ ڕەنگان جهێ وان ل ڤێری نابیت. هەر کەسەکێ بیانی هاتە ڤێرێ مە دەرگەهێ مالا خوە بۆ ڤەکر، دوور نینە سوباهی کووشك ژی هەوارا خوە بینتە دەڤ مە و ئەم دەرگەهێ مالا خوە بۆ وی ژی ڤەکەین، ب ڤی ڕەنگی ئەم ب خوە دێ بەلایێ ئینینە سەرێ خوە."

ژ نیشکەکێ ڤە سە لێ ڕەوی و گوتێ: "تە ئاگەهـ ژ دەڤێ خوە هەبیت، هۆسا تو یا سڤکاتیێ ب دلسۆزترین و باشترین زێرەڤان دکەی."

وەردەکان هەموویان دەست ب وەق وەقێ کر، مریشك ژی بێی کو پیتە ب دەنگێ وان بکەت، وێ ژی دەست ب قد قدێ کر، ئەڤ گەنگەشەیا وان یا بەردەوام بوو هەتا درەنگی شەڤ و ئەو نەگەهشتنە چ ئەنجامان و

دەنگێ قەرەبالغا وان یێ بەردەوام بوو هەتا جووتیار و هەڤژینا خوە ل وێ نیڤا شەڤێ فانۆسکەك هەلگرتی و هاتینە دناڤ باخچەی دا.

جووتیاری گوت: "هۆسا دیارە ئەو یێ شەڕی دکەن، پێدڤیە سپێدەیێ زوو ئەز چارەسەریەکێ بۆ وان ببینم."

پاشی وی بەرێ فانۆسکا خوە دا لایەکێ باخچەی، وی دیت دەنێ ئاڤێ یێ بەروڤاژی لێ هاتی و گەلەك پەرێن کەڤتینە واران. پشتی کو قەرەبالغا دەنگێ باڵندەیێن باخچەی نەمای، ڕۆناهیا فانۆسکێ کەڤتە سەر سونێ. جووتیاری ب کەنی ڤە گوتە هەڤژینا خوە: "سەحکێ کی یا ل ڤێرێ؟"

هەڤژینا وی گوت: "بەلێ ئەز یا دبینم، هۆسا دیارە یا خراب نینە."

جووتیار و هەڤژینا خوە ژناڤ باخچەی دەرکەڤتن، لێ دلێ سونێ ژبەر ئاخفتنێن وان ب گۆمان کەڤت. وێ ب هشیاری گوهێ خوە ددا وان داکو بزانیت کا دێ ئەو ل سپێدەیێ چ کەن. هەڤژینا جووتیاری پرسیار کر: "ئەرێ تو بێژی ئەم وێ بکەینە دناڤ کۆلکێ مریشکان ڤە یان ژی وێ سەرژێکەین و بۆ سوباهی ب شەڤ بکەینە خوارنا شیڤێ؟"

جووتیار: "تە چ دڤێت وەلێ بکە، نوکە بۆ من وەردەکا بچووك یا گرنگە، ئەز دبێژم ئەو تێشکا وەردەکێ کووڤی یە، لێ ئەز نزانم کا وی بکەمە د هێلینەکێ دا یان ژی پەرێن وی ببرم."

سونێ بەرەڤ پاشڤە چوو و هەست ب ترسەکا مەزن کر. دناڤ وان گیانەوەران هەموویان دا، ب تنێ سونێ گوهـ ل سحبەتا جووتیاری و

هەڤژینا وی بوو، دەمێ ئەو چووین دووبارە دیکل و مریشك هاتنە وێرێ و گەنگەشە دگەل وەردەکان کر و سەی ژی مایێ خوە د گەنگەشەیا وان کر.

مریشکێ دەست ب قد قدێ کر: "دڤێت ئەو ژ ڤێرێ بچن."

وەردەکان ژی دەست ب ویق ویقێ کر: "ئەڤ چەندە قەت چێنابیت." سەی ژی گوت: "من هەموو گاڤان وەك زێرەڤان ب باشترین شێوە کارێ خوە یێ ئەنجامدای."

نوکە هزرا سونێ هەموو ب تنێ یا ل سەر ئاخفتنێن جووتیاری و هەڤژینا وی، ئەرێ سوباهی ئەو دێ دناڤ کۆلکی ڤە بیت یان ژی دێ بیتە خوارن ل سەر سفرا جووتیاری و هەڤژینا وی؟ ژبەر هندێ ئەو گەلەك د ترسیت و لەشێ وێ دلەرزی.

چ پێنەڤێت ئەو چارەنڤیسێ ڕەش یێ سپێدەیێ خوە ل هیڤیا وێ گرتی، وەکی چاڤێن تەیسووك یێن کووشکی یێ ب ترسە دەمێ دناڤ تارپاتییێ دا خوە دڤەشێریت و تەماشەی وێ دکەت. نوکە ئەو گەلەك یا پەشیمانە کو دووبارە ڤەستا ناڤ باخچەی مالا جووتیاری کری. دیارە هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بوو لەوڕا وەردەکێ کووڤی گوتبوویێ ب چ ڕەنگان بەرەڤ باخچەی نەچی!

نوکە بێی کو گیانەوەرەکی ئاگەهـ ژ وێ هەبیت، هەروەسا بەری کو جارەکا دی دەرگەهێ کۆلکی ل بەر وێ بهێتە گرتن و پەڕێن جەگەرا وێ بهێنە قوساندن، دڤێت ب هەر ڕێکەکا هەبیت ئەو ژ ڤێرێ دوور بکەڤیت و خوە قورتال بکەت.

ئەو شەڤ بۆ سونێ هند یا درێژ بوو دا بێژی چ جاران دنیا نابیتە سپێدە، ئەو هەتا سپێدەیێ ما هشیار داکو بەری گیانەوەرێن دی ژ خەو هشیار بن ئەو جارەکا دی ژ باخچەی برەڤیت و کەس وێ نەبینیت. و ل دوماهیێ ڕۆژ هەلی و سونێ چاڤێن خوە یێن وەستیایی ڤەکرن و هەر زوو بەرەڤ دەنێ ئاڤێ چوو داکو هندەکێ ژێ ڤەخۆت و چاڤێن خوە بشوت.

هەموو گاڤان دیکل بەری هەموو گیانەوەران ژ خەو هشیار دبوو و بانگ ددا، لێ ژبەرکو شڤێدی هەتا درەنگ ئەو مژوولی کۆمبوونێ بوو لەوڕا هێشتا چاڤێن وی د خەون، سە ژی یێ کەڤتیە سەر جهێن خوە و یا پخ کریە خەوێ. سونێ هێدی چوو بن گوهێ چیچەلۆکا خوە و ژ خەو هشیار کر و گوتێ: "خوەشتڤیێ من، بێی کو یەکی ئاگەهـ ژ مە هەبیت دڤێت ئەم ژ ڤێرێ دەرکەڤین."

وی ژی گوتێ: "بلا دایکا من یا خوەشتڤی."

سونێ هێدی ل سەر نینوکێن خوە یێن پێیان بەرەڤ دەرگەهی دچوو بێی کو دەنگەك ژێ بهێت و چیچەلۆکا وێ ژی دا ب دووڤ ڤە، ل وی دەمی هێشتا دناڤ باخچەی دا دنیا پیچەکێ یا تاڕی بوو لێ سونێ د خەما هندێ نەبوو چونکی وێ دزانی چ نەمایە ب تەمامی دێ ڕۆژ هەلیت و وی باخچەی هەموویێ ڕۆهن کەت. ئەو هەردوو بەرەڤ دارا خەرنۆفێ ڤە چوون و پیچەکێ ل وێرێ ڕاوەستیان و سونێ ل پشت خوە زڤڕی و ب چاڤێن خەمگین تەماشەی پشت خوە کر. لێ وێ بەرێ خوە ژێ وەرگێڕا و بڕیار دا ئێدی چ جاران نەزڤڕیتە وێرێ. پاشی وێ پێنگاڤێن خوە قایم کرن و دمێ خوە تیژ کر و بەرەڤ پێشڤە چوون.

ترسا کووشکی هەموو گاڤان د دلێ سونێ دا بوو چونکی بەری هینگێ وی هەڤالەکێ وێ یێ خوەشتڤی یێ نێچیر کری. نوکە ئەو یا بەرەڤ برکێ ڤە دچیت کو رێکا وێ گەلەك یا ئاسێ و نەخوەش بوو، ئێدی ژیانا سونێ و وەردەکا وێ یا بچووك ل چوولی و دووری باخچەی یا بێ هەڤال و زێرەڤان بوو.

ئێدی کارێ سونێ ئەو بوو ب باشترین شێوە وەردەکا بچووك ب خوەدان بکەت و چاڤدێریا وی بکەت هەتا مەزن دبیت. هندەك جاران وێ ژبەرخوە ڤە گازی وەردەکێ کووڤی دکر داکو هێز و شیانان بدەتە وێ، لێ نوکە ئەو دشێت ب سانەهی دگەل وەردەکا بچووك ژی باخڤیت هەروەکی بابێ وی ل بەر سینگێ سونێ و دگەل وێ دئاخڤیت.

بەری ئەو بگەهنە برکێ، وەردەکا بچووك هەست ب وەستیانێ کر، ژبەر هندێ ئێدی ئەو نەشیا بەردەوامیێ بدەتە گەشتا خوە. سونێ ئەو دگەل خوە برە ناڤ بیستانەکێ برنجی و وان تێر ئەو ئاڤا دهێتە ناڤ بیستانی ڤەخوار و پاشی دەست ب خوارنا کولیان کر کو گەلەك دناڤ وی بیستانی دا هەبوون.

وەردەکا بچووك چوو بن بەلگێن گیایەکێ بلند و هەر زوو خەو کەڤتە چاڤێن وی، ژبەرکو شەڤا بەری هینگێ سونێ ژی هەتا سپێدی یا هشیاربوو، هەر زوو خەوێ چاڤێن وێ ژی گرتن و کەڤتە د خەوەکا کوور دا.

- "ویق ویق، ئەڤە چیە ل ڤێرێ؟"

سونێ گوهـ ل دەنگێ ویق ویقا هندەك وەردەكان بوو، لێ ژبەركو زێدە یا وەستیایی بوو نەشیا چاڤێن خوە باش ڤەكەت و ژ خەو ڕابیتەڤە. وەردەكەكێ پرسیار ژێ كر: "هێی، مریشكا بەلنگاز، ما تو نزانی ڤێری چەند یا ب مەترسی یە؟".

سونێ یەكسەر ژ خەو هشیاربوو و ڕابوو سەر پێن خوە و گوت: "ئۆی، ئەڤە چ خەون بوو من دیتی!"

سەركردەیێ وەردەكان ل سەرێ گری ڕاوەستیا بوو و تەماشەی وان دكر، وەردەكێن دی ژی هەموو ل پشت وی د ڕاوەستیایی بوون. وی پرسیار ژ سونێ كر: "هوون بۆچی ژناڤ باخچەی ڕەڤین، ل وێرێ هوون دا د پاراستی بن."

– "ئەم ژبەر هندێ ژ وێرێ هاتین چونكی ....."

ئەزمانێ سونێ لاڵ بوو و نەشیا بەردەوامیێ بدەتە ئاخفتنا خوە، وێ نەدڤیا بێژیتە سەركردەیێ وەردەكان كو ئێدی باخچە بۆ وێ جهەكێ ئارام نینە، هەروەسا ئەو نەشێن هاریكارییا وێ بكەن خو ئەگەر هات و بێژیتی ژی كا جووتیاری و هەڤژینا وی چ پیلان بۆ وێ و وەردەكا بچووك دانایە. سونێ گوت: "بۆ من گەلەك نەخوەش بوو كو هوون ژبەر مە دناڤ باخچەی دا تووشی ئاریشەیان بوون، مە نەڤیا ببینە بارگرانی بۆ كەسێ، ژبەر هندێ ئەم دێ نوكە بەرەڤ بركێ چین."

سونێ جارەكا دی دگەل وەردەكا خوە یا بچووك ب ڕێكەڤتن و بەرەڤ بركێ چوون. وەردەكێن دی هەموو ل دور وەردەكێ بچووك خڕڤە ببوون ب تایبەت وەردەكێن مێ، چونكی وان بەری نوكە چ وەردەكێن نێر

یێن هۆسا جوان و رێکوپێك نەدیتبوون. لێ دگەل هندێ ژی ملێ وەردەکێ بچووك ب ملێ سونێ ڤە بوو و قەت ژێ دوور نەدکەڤت.

یەك ژ تێشکێن وان وەردەکان گوتە سونێ: "سوپاس بۆ تە کو تە خوە ل هێکا وەردەکەکێ کریە خوەدان و ئەڤ وەردەکێ جوان ژێ دەرکەڤتی."

وەردەکەکا دی یا مێ گوت: "ئەڤە چەند وەردەکەکێ جوان و شیرینە! مخابن هەڤژینا جووتیاری هەموو گاڤان هێکێن مە ژبەر سینگێ مە رادکەت و دبەتە بازارێ دفرۆشیت یان ژی بۆ خوە ل مالێ دقەلینن، ژبەر هندێ کەسێ ژ مە تاما دایکینیێ نەدیتیە. راستی هەستەکێ گەلەك خوەشە مرۆڤی دناڤ خێزانا خوە دا زارۆکێن جوان هەبن و نوکە ئەو بوویە یەك ژ ئەندامێن خێزانا مە."

- "چ ؟ خێزان؟"
- سونێ ب تۆرەیی ڤە ئاخفتنا وێ بری و گوتێ: "ب چ رەنگان ئەز دەستان ژ وەردەکێ خوە بەرنادەم داکو بهێتە دناڤ خێزانا هەوە دا."
- "چەوا؟ باشە تو ئەڤ مریشکە دێ چەوا دگەل وەردەکێ ژی؟"
- "ئەز دایکم و دێ وی ب خوەدان کەم. جووتیاری دڤێت پەرێن وی ببریت داکو نەشێت بفریت. هوون هزر دکەن ئەز دێ خوە ب دەست ڤێ چەندێ ڤە بەردەم و دووبارە زڤرمە ناڤ باخچەی؟"
- "ئاها تو ژبەر هندێ ژ باخچەی رەڤی یە؟ تە قەت خەم پێ نەبیت و نەترسە چونکی چ ئێشان تێدا نینە دەمێ جووتیار پەرێن وی دقوسینیت، رەنگە هەر ئاگەهـ ژ ئێشانێ ژی نەبیت و هەست پێ

نەکەت، ئەڤە ژبەر هندێ یە داکو ئێدی نەرەڤیت و ژ باخچەی دوور نەکەڤیت."

– "چەوا؟ ئێدی ئەو نەشێت بفڕیت و ژ باخچەی دوور بکەڤیت؟"

– "نەخێر نەشێت وەبکەت، ئەڤ تێشکێ وەردەکێ یە، ژ نقشێ وەردەکێن کووڤی یە نەك وەردەکێن کەهی. ئەگەر تو وی کەهی نەکەی و فێری ژیانا مالێ نەکەی، ل پاشەڕۆژێ ژیانا وی دێ د مەترسیێ دا بیت. هۆسا ئێدی وەکی بابێ خوە دێ یێ بێ جهـ و مالێ بیت و دوور نینە ئەو ژی ببیتە نێچیرا کووشکی.

سونێ ب بێدەنگی و دلەکێ پڕی خەم ڤە هزرا خوە د وان خۆلەکان دا دکر دەمێ وەردەکێ کووڤی خوە کریە قوربان و بوویە نێچیرا کووشکی، لێ دگەل هندێ ژی ئەو یا ئامادە نینە ب چ ڕەنگان دەستان ژ جەگەرا خوە بەردەت. سەرکێشێ وەردەکان بەردەوام ب دووڤ سونێ ڤەبوو و هەموو بزاڤ دکرن وێ ڕازی بکەت داکو وەردەکێ بچووك دگەل وان بژیت.

وی گوتە سونێ: "تو هزرا خوە د وەردەکێ کووڤی دا بکە، ئەو هەموو گاڤان یێ بێ مال و حال بوو، ئەو نە یێ کووڤی و نە یێ کەهی بوو کو بشێت ب دروستاهی بەردەوامیێ بدەتە ژیانا خوە. ئەو نەدشیا چارەنڤیسێ خوە بگوهۆڕیت و ژیانەکا تەنا و ئارام بژیت. وی هەڤژینا خوە و پەڕەکێ خوە ژی هەر ژبەر کووشکی ژ دەستدان. لەوڕا ئێدی ئەو نەدشیا وەکی بەرێ بفڕیت و بەرەڤ دەڤەرێن سار و زڤستان لێ هەی گەشتێ بکەت؟"

– "چەوا؟ کووشکی پەڕێ وێ برینداركربوو؟"

- "ئەرێ ژبلی کووشکی ما دێ کی دی وەکەت؟"
- سونێ پیچەکێ بێدەنگ ما، نوکە ئەو باش تێگەهشت کا بۆچی هەردەمێ وێ ناڤێ کووشکی دئینا، پەڕ و موویێن سەر ملێن وەردەکێ کووڤی ڕەپ دڕاوەستیان و دلەرزین.
- "پاشی وی هەڤالا خوە، وەردەکا بەفرین، دیت و پێکڤە ژیانا هەڤژینییێ پێکئینا، لێ مخابن کووشکی هەڤالا وی ژی نێچیر کر و خوار."

سەرکێشێ وەردەکان هەناسەیەکا کوور هەلکێشا و بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە: "ئەڤ چەندە هەموو هاتنە ڕێکا وی چونکی وی ژیانا خوە یا کیڤی نەگوهاڕت و ژێ دوور نەدکەڤت. ئەگەر وەردەکا بەفرین دناڤ باخچەی دا ل سەر هێکا خوە کورك ببایە نوکە ئەو ژی دا دگەل مەبیت، لێ ئەز دبێژم هەکە جووتیاری هێکا وێ ژی بربایە کا چەوا هێکێن مە دبەت، ئەو نەدشیا ل سەر هێکا خوە کورك ببیت."

سونێ د جهێ خوە دا ڕەپ ڕاوەستیا و دوماهیك شەڤا وێ یا دناڤ مێرگا گولان دا هاتە بیرا وێ. نوکە وێ باش زانی کا وێ شەڤێ وەردەکێ کووڤی هزرا چ دکر و ب چ ڤە یێ مژوول بوو. ل وی دەمی خۆزیەکێ ئەو هەردوو پێکڤە گرێدابوون.

هاتە بیرا سونێ کو وەردەکێ کووڤی یێ نیگەران بوو نەکو سونێ بزانیت کو ئەو هێکا ئەو ل سەر کورك بووی هێکا وەردەکێ یە نەك یا مریشکێ، وی هزردکر هەکە سونێ ڤێ چەندێ بزانیت ل سەر کورك نابیت.

سونێ ددلێ خوە دا گوت: "خوە هەکە هینگێ من ئەڤ چەندە زانیبا ژی ئەز ب چ ڕەنگان ل سەر هێکێ نەڕادبووم، چونکی کەس نزانیت کا هینگێ ئەز چەند یا کەیفخوەش و بەختەوەر بووم دەمێ ئەز ل سەر وێ هێکێ کورك بوویم."

سونێ پیچەکێ پێنگاڤێن خوە گران کرن و چوو ب ڕەخ وەردەکی ڤە، وەردەکێن دی ژی وەکی وێ پێنگاڤێن خوە گران کرن داکو دگەل یەك بمینن. پاشی هەستەکا کەرب ڤەبوونێ یا مەزن د دلێ سونێ دا بەرامبەر کووشکی پەیدابوو. کووشك هەموو گیانەوەرێن بێهێز نێچیر دکەت و دخۆت، ژبەر هندێ سونێ هیڤی دکرن ئەو ژ کووشکی زیرەکتر با داکو تۆلێن خوە ژ وی ڤەبکەت، لێ وێ دزانی ئەڤ چەندە ب تنێ خەیالە و چ ژ دەستێن وێ ناهێت.

تژی چاڤێن سونێ ڕۆندك بوون دەمێ وێ هزرا خوە د وێ ژیانا سەخت و گران دا دکری یا ڕۆژێن بهێت ئەو و وەردەك دێ دناڤ چوولی دا دبورینن. لێ دگەل هندێ ژی وێ نەهێلا دمێ وێ ل سەر یەك ڕابیت و هەستێن خوە یێن ترس و نەخوەشیێ ڤەشارتن داکو وەردەکێن دی هەست پێ نەکەن.

ل دوماهیێ ئەو گەهشتنە سەر برکا ئاڤێ. هەر زوو وەردەك هەموو چوونە دناڤ ئاڤێ دا و مەلەڤانی کرن، لێ سەرکردەیێ وان ما ل سەر لێڤا کانیێ و دگەل سونێ دئاخفت و گوتێ: "گوهێ خوە باش بدە من، نوکە ئەو نزانیت کو ئەو وەردەکە، ژبەر هندێ نەشێت مەلەڤانیان ژی بکەت.

سەرەڕای جوداهیا دناڤبەرا پێن وی و یێن تە دا، لێ هێشتا ئەو هزردکەت ئەو ژ نفشێ مریشکانە."

سەرکردەی پەڕێن خوە ڤەکرن و بزاڤ کر وەردەکێ بچووك دگەل خوە ببەتە دناڤ ئاڤێ دا، لێ بزاڤا وی شکەستن ئینا چونکی وەردەکێ بچووك خوە ژ دەستا ئینا دەر و دگەل وی نەچوو د ئاڤێ دا و دەست ب گرییێ کر، هەلبەت ئەو بەری نوکە هۆسا یێ هاتیە فێرکرن کو خوە ژ ئاڤێ دوور بکەت داکو نەخەندقیت.

سونێ پەڕێن وی هشککرن و ب تۆڕەیی ڤە ل سەرکێشێ وەردەکان کرە هەوار: "بەلاَ خوە ژێ ڤەکە و مایێ خوە د وی نەکە."

هەر زوو وەردەکێ بچووك خوە هاڤێتە بەر سینگێ سونێ و ل بن پەڕێن وێ ڤە خوە ڤەشارت. سەرکێشێ وەردەکان ب خەم ڤە گوت: "تو یا شاشی، تێشکێ وەردەکان هەر دێ مینیت وەردەك خوە هەکە مریشکەك ژی وی ب خوەدان کەت و مەزن بکەت ژی." پاشی وی سەرێ خوە هەژاند و بەرەڤ ڕەڤدەیا وەردەکێن دی ڤە چوو.

دیسان سونێ ب خەم کەڤت و نەزانی دێ چ کەت، لێ نوکە ل سەر وێ یا پێدڤیە ئەو هێلینەکێ ل جهەکێ ب سلامەت بۆ وەردەکێ بچووك دروست بکەت. دەنگێ ڤەرەبالغا وەردەکان دهاتە گوهێن وێ دەمێ نێزیکی بەر لێڤا ئاڤێ دبووین. سونێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەز نزانم دێ نوکە چ کەم؟ لێ پێدڤیە ئەز هەموو هێز و شیانێن خوە بمەزێخم داکو وی ژ مەترسیا کووشکی بپارێزم."

سونێ نێزیکی زەڤیا لەڤەنێن شەکرێ بوو، هەر دەمێ بۆ یەکەم جار چاڤێ وێ ب لەڤەنان کەڤتی، گەلەك پێ داخبار بوو و هزرەکێ خوە ل سەرێ وێ دا. لەڤەنێن هشککری ل سەر ئەردی هاتبوونە ڕائێخستن لێ لەڤەنێن تەڕ و ژ نوو گەهشتی دگەل گژوگیای دناڤ زەڤیێ دا بوون. سونێ هزرکر ئەڤ چەندە جهەکێ باشە ئەو خوە لێ بڤەشێرن.

ژبلی کو دیمەنێ گول شلێر و گول سەوسەن و گولیێن گەنمی دناڤ ئاڤێ دا گەلەك یێ جوان و بالکێش بوو، خوارنەکا مشە و بەرفرەهـ ژی ل وێرێ هەبوو. کۆمێن بەقان ل سەر گول شلێران د ڕوونشتی بوون و کۆمێن کولیان ژی خوە ب لەڤەنان ڤە گرتبوون. ماسیێن بچووك و مێشومۆرێن ئاڤێ ژی ل سەر ڕوویێ ئاڤێ مەلەڤانی دکرن. هەلبەت ئەڤە جهەکێ گونجایی و خوەشە بۆ سونێ و وەردەکێ بچووك.

هیڤیيا سونێ ئەو بوو چ گیانەوەرێن دڕندە وان ل ڤێرێ نەبینن. پاشی وێ کۆمەکا لەڤەنێن هشك ڤێکدا و هێلینەك ژێ دروستکر. سونێ هزرکر پێدڤیە ئەو پیچەکێ سەنگا خوە کێم بکەت و قەبارێ خوە ژی بچووك بکەت داکو ئەو ژی وەکی باڵندەیێن دی بشێت خوە دناڤ ڤان داروبارێن ئاڤی یێن بۆش و چڕ دا بڤەشێریت.

وەردەکێ بچووك ژی ژ جهەکێ ژ واران دەرکەڤت و بزاڤ کر ل سەر بەلگێن گول شلێرەکێ بڕوونتە خوارێ، سونێ گازی کرێ و گوتێ: "هشیاربە خوەشتڤیێ من دا نەکەڤیە د ئاڤێ دا." لێ وەردەکی گوهێ خوە نەدا ئاخفتنێن وی و ژ گولەکێ خوە هاڤێتە سەر گولەکا دی، سونێ

بەردەوام گازی دکرێ لێ ئەو پیچ پیچە ژ ڕوویێ ئاڤێ دوور دکەڤت هەتا گەهشتە جهەکێ ئاڤا وی گەلەك کوور.

– "خوەشتڤیێ من، هەر نوکە بزڤڕە."

– "سەحکە من دادێ، ئەز چەند یێ دوور کەڤتیم."

– وەردەکێ بچووك ب شانازی ڤە پەڕێن خوە ڤەکرن، لێ پێ وی تەحسی و کەڤتە د ئاڤێ دا.

سونێ کرە ڤێژی: "هەوارە، هەوارە."

ژ ترسان دا سونێ بەردەوام دکرە ڤێژی و پێن خوە ل ئەردی ددان، وەردەکێ بچووك ژی دناڤ ئاڤێ دا بزاڤ دکر خوە قورتال بکەت داکو نەخەندقیت. سونێ زێدەتر خوە نەگرت و خوە هاڤێتە د ئاڤێ دا لێ هەر زوو پەڕێن وێ هەموو تەڕ بوون و ب زۆری شیا خوە بگەهینتە بەر لێڤێن ئاڤێ ڤە و قورتال بکەت.

وەردەکێ بچووك ب کەیفخوەشی ڤە گازی کرێ: "دادێ، دادێ، سەحکە من."

سونێ سەرێ خوە بلند کر و باش سەحکرە وی، وێ دیت وەردەك بن ئاڤ نەبوویە بەلکو ئەو ب خوە یێ ب سەر ئاڤ کەڤتی. ب ڕاستی ژی ئەڤە دیمەنەکێ ب کەنی بوو چونکی ئەوی گەلەك جوان مەلەڤانی دکرن. سونێ دەست ب کەنییێ دکر و د هەمان دەم دا چیکێن ئاڤێ ژ لەشێ وێ دکەڤتنە سەر ئەردی، نوکە ئەو گەلەك یا بەختەوەرە چونکی وەردەکێ بچووك یێ فێری تشتەکێ نوو بووی بێی کو یەك وی فێر بکەت.

وێ گوت: "بەلێ چ پێنەڤێت، پشتڕاست تو تێشکێ وەردەکانی."

ئێدی ئەو ڕۆژ ب سلامەتی بوری و سونێ پیچەك یا ماندی و بێهێز بوو. داكو ئەو بشێت ب سانەهی دناڤ لەڤەنان دا بهێت و بچیت، وێ پیچەكێ ژ سەنگا خوە ئینا بوو خوارێ و پێنگاڤێن خوە ژی هێدی دهاڤێتن و دەنگ ژ خوە نەدئینا داكو كەس هەست ب هەبوونا وێ ل وێرێ نەكەت. هەروەسا جووتەكێ باڵندەیێن ئاوازخوین هێلینا خوە ل جهەكێ نێزیكی وێرێ دروست كربوو و هێكێن خوە كربوونە تێدا.

هەر ژ ڕۆژا پەیدابوونا هەیڤا نوو و هەتا تەمامبوونا وێ، كەس نێزیكی هێلینا وێ یا دناڤ لەڤەنان دا نەبوو، هندەك جاران سونێ هەست ب ترسێ دكر دەمێ وێ هزرێن خوە د چاڤێن برسقی یێن كووشكی دناڤ تارپاتییێ دا دكرین، یان ژی هەكە دەنگێ لڤینا لەڤەنان هاتباییێ دا ژ ترسان دا لەرزیت. سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ ژی ئەو شیا ب ئاوایەكێ ئارام بژیت و ئەو ل سەر ڤێ چەندێ د بەردەوام بوون هەتا ل دوماهییێ سەركێشێ وەردەكان ب جهێ وان كەڤتی.

وەردەكێ بچووك فێربببوو هەموو سپێدەهیان بچیتە دناڤ ئاڤێ دا و مەلەڤانیان بكەت، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ مەزن دبوو و شیانێن وی یێن مەلەڤانیكرنێ و گرتنا ماسیان پتر لێ دهاتن، لێ هێشتا هەر شەڤ ل بن پەرێن سونێ دناڤ یەك هێلین دا دنڤستن.

ڕۆژەكێ ژ ڕۆژان، وەردەكی هەتا جهەكێ دوور مەلەڤانی كربوون و دەمێ زڤڕی سەركێشێ وەردەكان دگەل وی بوو و ل پشت وی مەلەڤانی دكرن. سونێ هەست ب هندێ كر كو سەركێشێ وەردەكان بێی حەزا وی یێ ب دووڤ وی كەڤتی و مەلەڤانیان دگەل دكەت.

وەردەکێن دی هەموویان ژی دابوو ب دووڤ ڤە، لێ سەرکێشی فەرمان لێکر کەس نێزیکی هێلینا لەڤەنان نەبیت. وەردەکان یاری ل سەر گول شلێران دکرن و ڤێ چەندێ ژی سونێ تۆڕە کر. باڵندەیا ئاوازخوین یا مێ دناڤ هێلینا خوە دا نە یا ئارام بوو و ب ترس ڤە ئاواز دخواندن، لێ بالندەیێ نێر ل هنداڤی وان دهات و دچوو داکو بزانیت کا چ ڕوددەت.

سونێ سەرێ خوە بلند کر ل وان وەردەکان حەیتاند ئەوێن چ جاران ل سەر هێکان کورك نەبووین و هەستا دایکینیێ ل دەڤ پەیدانەبووی، لێ وان نەدزانی کو ب ڤێ قەرەبالغا خوە ئەو یێ دلێ دایکەکێ دئێشینن کو نوکە ل سەر هێکێن خوە یا کورك بووی.

سونێ هیڤی دخواست کووشك ب دووڤ وان نەکەڤت بیت و ل وان جهان نەبیت داکو جهێ خوەڤەشارتنا وان نەزانیت. ل وی دەمی، سەرکێشێ وەردەکان کو ڤەت ئاگەهـ ژ نیگەرانییا سونێ و باڵندەیێن ئاوازخوین نەبوو، دەست ب ڤەکرنا بابەتەکێ تەمسارٍ و بێ مفا کر: "ئەڤ وەردەکە هند یێ مەزن بووی پیچەك مابوو ئەز وی نەنیاسم. هندەك نیشانێن وەردەکا بەفرین و هندەك نیشانێن وەردەکێ کووڤی ل دەڤ هەنە. ب ڕاستی تشتەکێ سەیرە! ئەو ب خوە یێ فێری هەموو تشتان بووی و گەلەك یێ شارەزا بووی بێی کو یەك هاریکاریا وی بکەت."

سەرکێشێ وەردەکان پەڕێ خوە ب سەرێ وەردەکێ پێگەهشتی دا ئینا، لێ ئەو پیچەکێ بەرەڤ پاشڤە چوو و پاشی تەماشەی سونێ کر ل پشت خوە و تەماشەی سەرکێشێ وەردەکان کر ل بەر سینگێ خوە.

سەرکێشی گوت: "دووبارە دێ بێژم تێشکێ وەردەکان هەر دێ مینیت وەردەك خوە هەکە مریشکەك ژی وی ب خوەدان کەت و مەزن بکەت، زارۆکێن نفشێ مە قەت مەلەڤانی و خوە بن ئاڤکرنێ ژبیر ناکەن. ئەڤ هەردوو بەهرەیە ب ئاوایەکێ زکماکی دگەل وان ژدایك دبن، ژبەر هندێ کەس نەشێت مە ژێ بێ بەهر بکەت و ئەم پێدڤی ب کەسێ نینن نیشا مە بدەت. ئەو وەکی مریشکێ نینە بێمنەتی و دالاهیێ ل ناڤ باخچەی بکەت و ژ ژیانا چوولی بترسیت."

دەمێ سەرکێشێ وەردەکان ئەڤ تشتە دگوتین، وی دڤیا پەیامەکێ بگەهینتە سونێ کو وەردەك ژ مریشکان باشترن. سونێ ب ئاخفتنێن سەرکێشێ وەردەکان کرە کەنی ئەوێ هۆسا خوە دیار دکری دا بێژی ئەو بابێ وی وەردەکی یە یێ سونێ ب خوەدان دکەت. ب ڕاستی ئەو ب چ ڕەنگان وەردەکێ وێ نانیاسیت و ب گوتنا ڤان ئاخفتنان ئەو نەشێت وی د سەردا ببەت داکو ژ دایکا خوە دوور بکەڤیت و بچیتە دگەل وان.

سونێ گوتێ: "تو هزر دکەی مریشك دترسن ل ناڤ چوولی بژین؟"

سەرکێشێ وەردەکان بەرسڤا وێ دا: "بەلێ ئەو دترسن ل ناڤ چوولی بژین لێ ژبلی تە. من بەحسێ مریشکێن ناڤ باخچەیە چونکی ئەو ژ جیهانا ژ دەرڤە د بێ ئاگەهن و قەت ئەو نزانن کو مریشکێن کەڤن دشیان ب ئازادی ل ئاسمانی بفڕن هەر گاڤا وان ڤیابا."

سونێ: "چەوا؟ بەری نوکە مریشك ژی وەکی باڵندەیێن دی دشیان بفڕن؟"

سونێ نەدشیا وان ئاخفتنان باوەر بکەت، ئەرێ ڕاستە مریشك دشێن ب ڤان پەڕێن لاواز ڤە بفڕن کو نوکە ئەو نەشێت چ کاران پێ بکەت ب تنێ ئەو نەبیت خوە ژ تۆزا دەوروبەری خوە بپارێزیت! بەری نوکە وێ دیتبوو هندەك جاران دیکلی خوە ژ سەر دیواری دهاڤێتە خوار و پەڕێن خوە ڤەدکرن، لێ ئەڤ چەندە نابیتە فڕینەکا ڕاستەقینە چونکی فڕین ئەوە بالندە بمینتە ل ئاسمانی و بۆ ماوەیەکێ درێژ بهێت و بچیت و ژ جهەکی بچیتە جهەکێ دی. سونێ هەموو گاڤان دخواست ئەو ژی بشێت جارەکێ بفڕیت هەروەکی کا چەوا بالندەیێن دی دشێن بفڕن.

سونێ دڤیا پرسیار بکەت کا بۆچی مریشکان شیانێن خوە یێن فڕینێ ژ دەستدان. بەری ئەو ڤێ پرسیارێ بکەت وێ پەڕێن خوە ڤەکرن دا بفڕیت، لێ ئەڤ پەڕە خوە نەشێن وێ ژ لەڤەنان بلندتر لێ بکەن ڤێجا چەوا دێ شێن وێ فڕینن.

سەرکێشێ وەردەکان بەرسڤا وێ دا: "ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ ڤەدگەڕیت چونکی هوون مریشك ب ڕۆژێ هەموویێ مژوولی خوارنێ و کرنا هێکانە. ئەڤ چەندە بوو ئەگەر هێدی هێدی پەڕێن هەوە لاواز ببن و چ مفا تێدا نەمینیت و لەشێ هەوە پتر ب گوشت کەڤت، لێ هێشتا هەتا نوکە ژی هوون خوە مەزن دکەن و دبێژن ئەم نوینەرێن هەتاڤێ نە ل سەر ڕوویێ ئەردی."

سونێ ب ئاخفتنێن وی دکرە کەنی چونکی دزانی ئەو ب چ ڕەنگان نەوێریت ڤان ئاخفتنان ل دەڤ دیکلی بێژیت لەوا نوکە بۆ وی دەلیڤە یا هەلکەڤتی د پشت وی ڕا باخڤیت. سونێ گوت: "باشە مادەم ژبەر خوارنا

زێده پشتا مه قەلەو بوویە، ئەرێ پا بۆچی وەردەك دهەلنگڤن دەمێ برێڤه دچن؟ باشه پا هەوە وەردەکێن ناڤ باخچەی ژی پەڕ یێن هەین، بۆچی هوون وان پەڕان بۆ فڕینێ بکارنائینن؟"

سەرکێشێ وەردەکان دڤیا خوە ژ پرسیارا سونێ ڤەدزیت چونکی وی ب کرنا ڤێ پرسیارێ هەست ب کێماسییێ کر، ژبەر هندێ وی بابەت گوهۆڕی و گوت: "تە ڕاستی بڤێت ئەز یێ هاتیم ل سەر بابەتێ تێشکا وەردەکێ دگەل تە باخڤم چونکی بۆ وی نە یا گونجایە ئەو د کاودانێن هۆسا دا مەزن ببیت، بلا بهێت دناڤ باخچەی دا دگەل مە بژیت، ئەگەر تو ژی نەهێی هەما دەلیڤەیێ بدە وی بلا ئەو بهێت."

سونێ ب ڤێ ئاخفتنا وی تۆڕەبوو و گوت: "نەخێر ڤێرێ چ ل مە ناهێت، لێ ئەگەر تو بەردەوام ب دووڤ مەڤە بی و ڤێ قەرەبالغێ ژی بدەیە دووڤ خوە، ل وی دەمی هەر کەسێ بڤێت دێ ب سانەهی ب جهێ مە کەڤیت. هیڤی دکەم دەستان ژ مە بەردە و دگەل خێزانا خوە بزڤڕە مال چونکی مە ل ڤێرێ جهێ خوە یێ دانایی و ئەم ب چ ڕەنگان نازڤڕینە وێرێ."

پاشی سەرکێشێ وەردەکان ب خەم ڤە گوت: "ئەڤە چەند ڕۆژە دوو چیچەلۆك ژناڤ باخچەی یێن دەرکەڤتین و دیار نەماینە، ئەو چیچەلۆك گەلەك د مایتێکەر بوون و دچوونە ناڤ بیستانێ کەسکاتی و فێقی دا و پاشی بەرەڤ سەرێ گری چوون. ژبەر هندێ مریشکا دایکا وان گەلەك یا خەمگینە و ب چ ڕەنگان ژ باخچەی نادەرکەڤیت."

موویێن گەردەنا سونیٚ قژ بوون و کەربا ویٚ بۆ کووشکی پتر لیٚ هات چونکی ویٚ دزانی ئەو ب تنیٚ باڵندەیان نێچیر دکەت و دخۆت. پاشی ویٚ گازی وەردەکی کر: "خوەشتڤییٚ من کا وەرە ڤێریٚ."

سونیٚ دڤیا وەردەکی بکەتە د بن پەڕێن خوەڤە، لیٚ دەمیٚ وەردەك نێزیکی وێریٚ بووی پیچەکیٚ سەحکرە دایکا خوە و پاشی تەماشەی سەرکێشیٚ وەردەکان ژی کر، ڤیٚ چەندیٚ هەستێن دایکا وی بریندار کرن و زانی وی تشتەك هەیە.

پاشی سەرکێشی گوت: "بۆ مریشکا دناڤ باخچەی دا کارەکیٚ ب زەحمەتە چاڤیٚ خوە بدەتە گەلەك چیچەلۆکان، لیٚ ئەم نە وەکی وانە چونکی خێزانا مە یا مەزنە و ئەم دشێین چاڤیٚ خوە بدەینە وەردەکەکیٚ ب تنیٚ. خوە نەوەستینە و وەردەکیٚ بدەڤ مە، ژبەرکو نوکە کووشکی تامکریە گوشتیٚ تەڕ و نازكییٚ چیچەلۆکان و نوکە تام ب دەڤیٚ وی کەڤتیە لەوڕا دیٚ هێت ل چیچەلۆکێن دی ژی گەڕیت."

سونیٚ دمیٚ خوە تیژ کر و هەست ب سیبەرا وی گیانەوەریٚ دڕندە دکر خوە دا بێژی ییٚ نێزیکی ویٚ دبیت. سەرکێشی دیسان گوت: "چ پێنەڤێت دیٚ کووشك هێتە ڤێرە ژی و دبیت بەری نوکە ژی ئەو د ڤێریٚ ڕا هاتبیت و نوکە زێرەڤانیا ڤی جهی بکەت."

سونیٚ ژ ڤان گوتنێن سەرکێشیٚ وەردەکان تۆڕەبوو و ب دەنگەکیٚ بلند گوتیٚ: "هەر نوکە ژ ڤێریٚ هەڕە و مە بهێلە ب تنیٚ، نوکە دگەل خێزانا خوە هەڕە و نەمینە ل ڤێریٚ."

سەرکێشی پێشبینی نەدکر دێ سونێ ب ڤی ڕەنگی ژ وی تۆڕە بیت و لێ کەتە هەوار لەورا ئەو ژی ب تۆڕەبوون ڤە ژ دەڤ وێ چوو و گوت: "تو مریشکەکا گەلەك سەر ڕەقی، خوە هەکە تو چەند بزاڤان بکەی داکو تو وی وەکی چیچەلۆکەکا مریشکان ب خوەدان بکەی تو نەشێی چونکی ئەو تێشکێ وەردەکانە و دێ هەر مینیت وەردەك خوە هەکە تو ڕۆژانە وی هەمبێز بکەی و ل دەڤ خوە بنڤینی ژی."

دەنگێ وەردەکێن دی ژی بلند بوو و خوە نەڕازی دکر ب تایبەت پشتی زانی سونێ ناهێلیت ئەو وەردەکی دگەل خوە ببەن. قەرەبالغا ڤان وەردەکان هند مەزن بوو هەتا بالندەیێ ئاوازخوین گەلەك ترسیا و بەردەوام ئاوازێن نەخوەش دژەنین تاکو هێدی هێدی ئەو ژ وێرێ دوورکەڤتین و دەنگێ قەرەبالغا وان ژی نەمای.

ل دووڤ دا سونێ گوتە وەردەکی: "خوەشتڤیێ من، دڤێت هەر نوکە ژ ڤێرێ بچین چونکی ئێدی ڤێرە نە جهەکێ ئارامە بۆ من و تە."

- "بۆچی دادێ؟"
- "ئەڤ کۆما وەردەکان ب جهێ مە حەسییان و ئێدی دێ گەلەك جاران هێنە ڤێرێ و دوور نینە ئێدی جارەکێ کووشك ژی ب دووڤ وان بکەڤیت و ئەو ژی ب جهێ مە بحەسییێت، ئەو گیانەوەرەکێ گەلەك دڕندەیە و نێچیرێن خوە ب ساخی دخۆت و قەت بەلا خوە ژ مە ڤەناکەت هەتا مە نێچیر نەکەت، ڤێجا بەری دنیا ببیتە شەڤ دڤێت هەر نوکە ئەم ژ ڤێرێ بار بکەین."

پاشی سونێ ڕابوو ئەو پەڕێن ژ لەشێ وێ کەڤتین هەموو خڕکرن و هاڤێتنە دناڤ ئاڤێ دا و ل دووڤ دا ب دمێ خوە هێلینا خوە خڕاب کر و چ شوونوارێن وێ نەهێلانە ل وێرێ. پاشی ئەو هێدی ژناڤ زەڤیا لەڤەنان دوورکەڤتن داکو نەخوەشیێ بۆ بالندەیێن ئاوازخوین چێنەکەن.

وەردەك هەر بێهن بێهنە ل دوور خوە دزڤڕی و تەماشەی ئاڤێ دکر و حەز نەدکر ژ وێرێ بچن. سونێ دزانی کو وی نەڤێت ژ ڤی جهی بچن داکو ئەو بشێت بەردەوام بۆ خوە مەلەڤانیان تێدا بکەت.

هێدی هێدی ڕۆژ ئاڤا بوو و دنیا بۆ تاری. سونێ زەڤیەکا تژی گژوگیا دیت کو دکەڤتە بنێ وی ژێهەلیێ بەرامبەر زەڤیا لەڤەنان. پاشی وێ دیت زەلامەك هات و چێلەك یا دگەل و چێل ب دارەکێ ڤە گرێدا. گژوگیای ل بن دارێ گەلەك یێ بلند بوو و چونکی وەریسکێ ستۆییێ چێلێ یێ درێژ بوو لەوڕا ئەو پیچەکێ ژ دارێ دوورکەڤت بوو و گیای وێرێ دخوار.

سونێ باشی تەماشەی بنێ دارێ کر و باش ل وان جهان گەڕیان، پاشی وێ هندەك کۆمێن پیساتیێ چێلێ دیتن کو ل وان جهان د بەلاڤە بوون. مانا وان دناڤ زەڤیەکا ڤەکری دا جهێ مەترسیێ بوو، لێ وان چ ڕێکێن دی نەبوون و پێدڤی بوو ئەو ئەڤ شەڤە بمیننە ل وێرێ. سونێ گوت: "چ ئاریشە تێدا نینە ئەگەر ئەم شەڤەکێ بمینینە ل ڤێرێ چونکی بێهنا نەخوەش یا پیساتیێ چێلێ دێ بێهنا مە بەرزە کەت و کەس هەست ب جهێ مە ناکەت."

هەر زوو سونێ کورکەکا مەزن کۆلا کو جهێ وێ و وەردەکی تێدا دکر، پاشی ئەو هەردوو چونە تێدا و بێهنا خوە ڤەدا، هەرچەندە گیای وێرێ گەلەك یێ بلند بوو ب سەر سەرێ وان دکەڤت و ئەو بەرزە کربوون لێ سونێ ژ ترسان دا هەر نەدشیا بنڤیت.

وێ شەڤێ ڕۆناهیا هەیڤێ یا گەش بوو، وەردەك هەر زوو د خەو چوو و ب ئارامی بێهنا خوە دهەلکێشا. هێدی هێدی بێدەنگیا شەڤێ پەڕێن خوە ب سەر وی جهی دا بەردان و هەتا دەنگێ لڤینا گیای ژی نەمایی لێ سونێ هەر ما هشیار و چاڤێ وێ ما ل وێ تاریاتیێ هەتا سپێدێ.

نوکە ڕەوشا سونێ وەکی ڕەوشا وەردەکێ کووڤی بوو، ل وان ڕۆژان سونێ ژی وەکی زارۆکەکێ ساڤا ب ئارامی دنڤست و وەردەکێ کووڤی هەتا سپێدێ زێرەڤانی لێ دکر و ئەو ژ مەترسیا کووشکی دپاراست. دڤێت نوکە ئەو ژی وەکی وی یا وێرەك و چاڤنەترس بیت.

ژ نیشکەکێ ڤە هزرەك هاتە د سەرێ وێ دا، ئەو هزر هند یا ڕۆهن و ئاشکەرا بوو هەروەکی دا بێژی چپکەکا ئاڤا تەزی کەڤتە سەر مەژیێ وێ. سونێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەز دزانم کووشك نەدشیا چ بکەت هەتا وەردەکێ کووڤی خوە ڕادەستێ وی کری، ئەڤ چەندە وەکی چالا مرنێ بوو چونکی ل وێ شەڤێ ژی کووشك نەدشیا چ بکەت و چ ژ دەستان نەدهات چونکی ئەز یا وێرەك بووم و من بەرەڤانی ژ خوە دکر. ئانکو هندی ئەم د زیرەك و چاڤنەترس بین ئەو نەشێت زیانێ بگەهینتە مە."

ب ڤان هزران ووڕەیا سونێ بلند بوو و هەست ب وێرەکیێ کر، ئەو ژ کورکێ دەرکەڤت و تەماشەی زەڤیا لەڤەنان کر، ب ڕاستی ژی جهێ

شەرمزاریێ بوو وان هێلینا خوە ل وێرێ بجهـ هێلای، لێ ئەو جهـ ژی وەکی باخچەی ئێدی ب کێر ژیانا وێ نەدهات.

سونێ هەست ب شەپرزەیی و پۆسیدەییێ کر، بەری نوکە ژی ئەو ڕازی نەبوو جارەکا دی ناڤ قەفەسکێ دا بهێتە زیندانکرن یان ژی دناڤ باخچەی دا بمینیت دگەل باڵندەیێ دی، ژبەر هندێ ل سەر وێ یا پێدڤی بوو هێلینا خوە یا دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا ژی بجهـ بهێلیت. دەمێ دنیا دبیتە سپێدە ئەو دێ یا نەچار بیت ڤی جهی ژی بهێلیت.

سونێ ب خەم ڤە گوت: "ئەز نزانم بۆچی ژیانا من هندە یا نەخوەشە؟ ئەرێ ئەڤ چەندە هەموو ژبەر هندێ دهێتە سەرێ من چونکی من خەون و هیڤی هەنە؟"

پاشی وێ هزرا خوە د وەردەکێ کووڤی دا کر، بەری نوکە ژی وێ بەردەوام هزرێن وی دکرن و هێشتا ڤیانا وی مابو د دلێ وێ دا، لێ نوکە پتر ژ هەموو گاڤان وێ دخواست ئەو ل دەڤ وێ با. وێ دخواست جارەکا دی وێ گوهـ ل دەنگێ وی ببا و ئەو دیتباڤە.

ژ نیشکەکێ ڤە، جرفەك ب سونێ کەڤت، تشتەك ل بەر چاڤێن وێ لڤلڤی، وێ یەکسەر خوە نزم کر و بێدەنگ ما، وێ دیت سیبەرەکا ڕەش هێدی هێدی یا دچیتە دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا، سونێ پشتڕاست بوو ئەو کووشك بوو چونکی گەلەگ بلەز دچوو و وێ ئەو ژ لەزاتییا وی نیاسی.

سونێ گەلەك ترسیا و چوو دناڤ کورکا خوە دا و گیانێ وێ دلەرزی، کووشك چوو دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا و بۆ ماوەیەکی سەرێن وان لەڤەنان دلڤلڤین و پشتی وی چ تشت نەدیتین، ب دەستێن ڤالا ژ وێرێ دەرکەڤت و

دێمێ وێ یێ ب خەم بوو. ئەڤ جارە ژی سونێ شیا خوە ژ دەستێن وی قورتال بکەت. وێ د دلێ خوە دا دگوت: "سوپاس بۆ خودایێ مەزن کو نوکە ئەم ل وێرێ نینین، ژبەر هندێ ئەو نەشێت مە بگریت."

پشتی هینگێ کووشك ژ وی جهی دەرکەڤت و نەما ل وێرێ هەمووییێ.

ڕۆژا د دووڤ دا، سونێ و وەردەکێ خوە بەرەڤ زەڤیا لەڤەنان چوون، وەردەك هەر زوو چوو دناڤ ئاڤێ دا مەلەڤانی کرن و گەلەك یێ کەیفخوەش بوو، لێ سونێ چوو ل وان جهان بگەڕیت داکو بزانیت کا چ ڕوودایە. لێ سونێ تشتەك ل وێرێ دیت گەلەك مەندەهۆش ما.

وێ دیت کارەساتەك ب سەرێ بالندەیێن ئاوازخوین هاتیە، سونێ گەلەك تۆڕەبوو دەمێ دیتی هێلینا وان یا هاتیە خڕابکرن و هێکێن وان یێن شکەستین و هندەك پەڕ یێن ل وێرێ بەلاڤە بووین. مخابن پیچەك مابوو ئەو هێك بمەرقن و باڵندەیێن جوان ژێ دەربکەڤن، هەروەسا باڵندەیا مێ ژی نەمابوو ل واران و یێ نێر مابوو ب تنێ و دکرە گری و ل دور زەڤیا لەڤەنان دزڤڕی، چ پێنەڤێت شڤێدی کووشکی ئەو یا خواری.

سونێ ب ترس و لەرز ڤە ئەو جهە هێلا و سووند خوار ئێدی ئەو ل چ جهان هێلینان بۆ خوە چێنەکەت و بەردەوام بمینتە هشیار و زێرەڤانییا سیبەرا وی دڕندەی بکەت بەری نێزیکی وان ببیت.

بۆ هەیامەکا درێژ ل سەر یەك باران بارینێ دەستپێکر و نەڕاوەستیا، زەڤیا لەڤەنان پڕی ئاڤ بوو تا وی ڕادەی پیچەك مابوو ب تەمامی هەموو لەڤەنان بن ئاڤا بکەت. هەرچەندە بارینا بارانێ تشتەکێ ئاسایی بوو لێ ئەڤ جارە ببوو ئەگەرێ هندێ چ جهێن هشك نەمینن.

چەندین ڕۆژێن نەخوەش و دژوار ب سەر سونێ دا هاتن، ل ڤان ڕۆژێن نەخوەش دا بۆ وێ یا ب زەحمەت بوو جهەکێ هشك و گونجایی ببینیت داکو هێلینەکێ بۆ خوە و وەردەکی دروست بکەت. هەروەسا ژبەر تەڕبوونا پەڕێن وێ و نزمبوونا پلەیێن گەرماتییێ ئەو تووشی پەرسیڤێ بوو. ئێدی ئەو گەلەك یا لاواز و بێهێز بوو چونکی وێ هەر شەڤ ژ ترسێن کووشکی دا جهێ نقستنا خوە دگوهاڕت و نەدشیا تێر بنڤیت.

ژ لایەکێ دی ڤە، وەردەکێ بچووك هێدی هێدی مەزن دبوو و نوکە یێ بوویە وەردەکەکێ پێگەهشی یێ جوان و بالکێش و پیچ پیچە نیشانێن بابێ وی، وەردەکێ کووڤی، ل دەڤ وی دیار دبن. هەلبەت ئەڤێ چەندێ سونێ ب خوە ژی مەندەهۆش کربوو و ببوو جهێ خوەشحالیا وێ.

نوکە وەردەك یێ مەزن بووی و پێدڤی ناکەت ئێدی هەر ب ناڤێ وەردەکێ بچووك بهێتە گازیکرن، ژبەر هندێ سونێ ناڤەکێ نوو بۆ وی دانا. ژبەرکو موویێن سەرێ ڤی وەردەکی د کەسك بوون، سونێ بڕیار دا ناڤێ وی بکەتە "سەرکەسك".

هەتا ب دوماهی هاتنا وەرزێ باران بارینێ، ژ نوو پەرسیڤ ژ سونێ چوو و ساخلەم بوو ڤە، لێ لەشێ وێ یێ لاواز هەر وەکی خوە ما و قەلەو نەبوو ڤە. سونێ د دلێ خوە دا دگوت: "تشتەکێ ئاسایی یە هەکە ئەز یا

لاواز بم چونکی ئەز یا ب ناڤسال ڤە چوویم و د هەمان دەم دا سەرکەسك ژی یێ مەزن بووی."

سەرەڕای لاوازیا لەشێ خوە، لێ هێشتا سونێ یا پەیت بوو و دشیا خوە ل سەر پێن خوە بگریت و دەمێ دنیا دبوویە شەڤ ئەو ب باشی دشیا تێبنییا لڤینا هەر تشتەکی دناڤ تاریاتیێ دا بکەت، هەروەسا دمێ وێ ژی هێشتا یێ ڕەق بوو و پەنجێن وێ ژی بهێز بوون.

د وی ماوەی هەموویێ دا، چ جاران سونێ و سەرکەسك دوو شەڤان ل دووڤ یەك دا ل یەك جهـ نەدنڤستن. هەروەسا سونێ هەموو گاڤان زێرەڤانیا کووشکی دکر دەمێ ل جهێ وان دگەڕیایی و دەست ڤالا دزڤڕیە مالا خوە ڤە.

چ پێنەڤێت ژیانەکا ب ڤی ڕەنگی کو هەڕۆژ مرۆڤ ل جهەکی بیت و بەردەوام ڤی جهی بگوهۆڕیت گەلەك یا ب زەحمەتە لێ هندەك جاران کاودانێن نەخوەش و ب زەحمەت مرۆڤی نەچار دکەن ڤێ چەندێ بکەت. دبیت ئەڤ چەندە بۆ سونێ تا ڕادەیەکی یا ئاسایی بیت لێ بۆ سەرکەسکی کارەکێ ب زەحمەت بوو چونکی ئەو هەموو گاڤان یێ پۆسیدە بوو و هزرێن خوە دکرن.

پشتی کو سەرکێشێ وەردەکان سەرەدانا وی کری، پتریا جاران ئێدی سەرکەسك ب تنێ دا ڕوونتە خوار و هزرێن خوە کەت. نوکە پۆسیدەییا وی زێدەتر لێ هاتیە ب تایبەت پشتی ڕەنگێ پەڕێن وی هاتیە گوهۆڕین. د هەمان دەم دا سونێ ژی یا پۆسیدە بوو چونکی ئێدی سەرکەسك هند گرنگیێ ب وێ نادەت و ب بۆچوونێن وێ ناکەت.

ل دوماهییێ جارەكا دی باران ڕاوەستیان و ستێران ئاسمان نەخشاند. ئێدی پەڕێن سونێ ژی وەكی بەرێ ب تەمامی هشك بوون و ئاستێ ئاڤێ دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا هاتە خوار و ئەو دشیان ل وێرێ بنڤن، لێ سونێ و سەركەسك بەرەڤ سەرێ گری ڤە چوون و خوە دناڤ كونجەكا بچووك ڤە دناڤ كەڤرەكێ مەزن ڕا ڤەشارتن. بەری نوكە ژی دەمێ باران بارینێ ئەو هندەك جاران چووبوونە وێرێ، لێ سەركەسكی حەز ژ ڤی جهی نەدكر چونكی گەلەك یێ بلند بوو و د هەمان دەم دا یێ ژ ئاڤێ ژی دوور بوو.

سونێ گوت: "ئەڤە دوو ڕۆژە من كووشكێ نێچیرڤان نەدیتیە، لێ پشتڕاست ئەو دێ هەر هێتە ڤێرێ ڤە. ئەو دێ دووبارە هێتە دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا و دێ ل گیاندارەكێ زیندی گەڕییێت خوە هەكە چەند یێ بچووك ژی بیت وەكی باڵندەییێن ئاوازخوین داكو برسا خوە پێ بشكێنیت."

نوكە وەكی بەرێ سەركەسك هند گوهێ خوە نادەتە سونێ، ئەو گەلەك جاران بێی وێ ب تنێ دچیتە دناڤ مێرگا گولان و بركا ئاڤێ دا و هزرێن خوە دكەت. ڤان ڕەفتارێن وی یێن سەیر ئێدی سونێ تووشی نەئارامیێ كربوو. سونێ چوو دناڤ شكەڤتا بچووك دا و ژ پشت ڤە تەماشەی سەركەسكی دكر، نوكە ئەو یێ مەزن بووی. هەلبەت ڤێ چەندێ ژی سونێ خەمگین كربوو چونكی نوكە ئەو یێ مەزن بووی و وەكی بەرێ گوهێ خوە نادەتە وێ.

سونێ هەموو گاڤان یا چاڤتڕسیایی بوو ژبەر سەركەسكی چونكی ئەو دترسیا كووشك نەخوەشیان بگەهینتە وی هەروەكی كا چەوا بەری

نوکە نەخوەشی گەهاندینە بابێ وی ژبەرکو هەر گیانەوەرەکێ هۆسا کوور بچیتە د هزران دا و ئاگەهـ ژ دەوروبەرێن خوە نەمینیت دێ بیتە نێچیرەکا ب سانەهی بۆ کووشکی.

سونێ دڤیا گازی سەرکەسکی بکەت داکو بهێتە ب ڕەخ وێ ڤە، لێ هێشتا ئەو ب دروستاهی ژ جهێ خوە نەڕابووی وێ هند دیت سیبەرەکا ڕەش ل سەر کەڤرێ شکەڤتێ کەڤتە خوارێ و بەرەڤ برکێ چوو، دەنگەك ژی دگەل ڤێ سیبەرێ بوو و وەکی دەنگێ بای بوو، لێ د ڤی ماوەی دا چ با نەدهاتن و سەقا یێ ئارام بوو.

بێهنا سونێ چك بوو و پیچەك مابوو دلێ وێ ژ ترسان دا بڕاوەستیت. وێ گوت: "هەرێ، ئەڤە نە کووشك بوو، من چەوا هۆسا شاشییەکا مەزن کریە و ئەم ماینە ل ڤی جهێ ب مەترسی."

هەتا نوکە ژی ئەو شیا بوون خوە ژ کووشکی بپارێزن لێ هۆسا دیارە ئەڤ جارە ئەو دێ کەڤنە بەر دەستێن وی. ل وی دەمی سەرکەسك ژی چوو د هزران دا و قەت ئاگەهـ ژ هندێ نەبوو کو کووشك یێ نێزیکی وی دبیت، سونێ ژی ب زۆری شیا ل سەر خوە زالێ ببیت و هزران بکەت داکو بزانیت دێ چەوا ئەڤ جارە خوە ژ دەستێن وی قورتال کەن.

مانێ ئەو دایکە، ڤێجا قەت باوەرنەکە ئەو هۆسا ب سانەهی زارۆکێ خوە بهێلیتە د دەستێن کووشکی دا و ل پێش چاڤێن وێ، وی بخۆت، ژبەر هندێ سونێ کوور بێهنا خوە هەلکێشا و بلەز بەرەڤ بنارێ وی گری چوو. سونێ کرە هەوار: "ئەی کووشکێ پیس ژ ڤێرێ دوور بکەڤە."

کووشك ل پشت خوە زڤڕی و سەحکرە سونێ، ل وی دەمی هەر یەکسەر سەرکەسکی پەڕێن خوە لێکدان ب تڕس ڤە کرە هەوار. بەری کووشك بەرەڤ سونێ بچیت، وی تەماشەی سەرکەسکی کر، وی دیت ئەو نوکە ژ بەرێ مەزنتر و بهێزتر یێ لێ هاتی. هەروەسا سونێ ژی دزانی ئێدی ئەو ژ دەستێن کووشکی قورتال نابن لەوڕا بڕیار دا ل بەر سینگێ وی بڕاوەستیت.

سەرکەسك جار بۆ جارێ پتر دتڕسیا و پەڕێن خوە لێکددان. سونێ دمێ خوە تیژ کر و پەنجێن خوە ئینانە دەر و ڕك و ڕك تەماشەی چاڤێن کووشکی کر. هۆسا دیارە ئەڤ جارە سونێ ڤیا هەڤڕکیا مرنێ بکەت، لەوڕا ژی بێی تڕس ل بەرامبەر کووشکی ڕاوەستیا و گوتێ: "بزاڤێ نەکەی خوە نێزیکی سەرکەسکی بکەی."

کووشکی سەرێ خوە هەژاند و ب باشی تەماشەی سونێ کر و ب دەنگەکێ ب تڕس ڤە گوتێ: "تو مایێ خوە د ڤی کاری نەکە." ئەڤ جارە ئارمانجا سەرەکی یا کووشکی ئەو بوو سەرکەسکی نێچیر بکەت ژبەر هندێ وی هند گرنگی نەددا سونێ و دگەل وێ درێژ نەکر.

سونێ دیسان گوت: "دبێژمە تە دەستێ خوە نەکەیە وی و هەر نوکە ژ وی دوور بکەڤە."

دووبارە کووشکی ب ناڤ چاڤ گرێ و کەرب ڤە ل وێ زڤڕی. سونێ هەست پێ دکر لەشێ وێ ها وەختە دێ کەلیت و دلێ وێ ژی هند بلەز خوە دقوتا خوە دا بێژی وەختە دێ پەقیت. کەربا وێ یا مەزن بوو ئەگەر ئەو تڕسا کووشکی و دڕنداتیا وی ژبیر بکەت.

هێشتا ب دروستاهی کووشکی پشتا خوە نەدایە سونێ، ئەو بلەز بەرەڤ وی ڤە چوو هەروەکی کا چەوا پەلاتینکەك بەرەڤ ئاگری دچیت بێی کو بزانیت دێ پەڕێن وێ سوژن، ئاها هۆسا وێ ژی ژ پشتێ ڤە هێرشکرە سەر کووشکی و ب دمێ خوە یێ تیژ پشتا وی بریندار کر.

کووشکی دڤیا هێرشێ بکەتە سەر سەرکەسکی ب تنێ، لێ ژبەرکو دمێ سونێ کوور دناڤ پشتا کووشکی ڕا چوو بوو خوار، لەوڕا کووشکی ئەو ل دووڤ خوە ڕاکێشا هەتا هەردوو پێکڤە گرێل بووین.

ل ڤی دەمی نینوکێن کووشکی زکێ وێ بریندار کر و ئەو هەردوو هەر مابوونە پێکڤە هەتا ل دوماهیێ ب بەرەکی کەڤتین ژ نوو لەشێن وان ژێکڤە بوون. سونێ گێژبوو، پیچەك مابوو هوشێن خوە ژ دەست بدەت، ب دەنگەکێ نرم و خەمگین ڤە گوت:" بڕەڤە، خوەشتڤیێ من بڕەڤە و خوە قورتال بکە."

ئێدی سونێ نەشیا خوە ژ جهێ خوە بلڤینیت یان تشتەکی ل پێش چاڤێن خوە ببینیت. دەمێ وێ چاڤێن خوە باش ڤەکرین، وێ هەستپێکر تشتەك یێ مایە د بەر دمێ وێ ڕا کو ئەو ژی پرتەکا گوشتێ لەشێ کووشکی بوو. ژبەرکو سونێ ب هێز دمێ خوە دانابوو پشتا وی لەوڕا پرتەکا گوشتێ لەشێ وی مابوو د بەر دمێ وێ ڕا. سونێ هێدی هێدی ڕابوو ڤە و ل سەرکەسکی دگەڕیا: "خوەشتڤیێ من! سەرکەسك تو ل کیڤەی؟"

بێدەنگیێ ئەو جهـ داگیر کربوو، ئەرێ تو بێژی کووشکی ئەو ژی نێچیر کربیت؟ ئەرێ ژ ڕاستا سەرکەسك مریە؟ ڕۆندك ژ چاڤێن سونێ

هاتنه خوار. نەخوەشیا ژ دەستدانا سەرکەسکی گەلەك مەزنتر و ب ئێش و ژانتر بوو ژ نەخوەشیا برینێن لەشێ وێ. سونێ د دلێ خوە دا دگوت: "هەی کووشکێ درندە، پێدڤی بوو تە ئەز خوار بام نەك ئەو وەردەکێ بچووك یێ کو هێشتا تێر دنیا نەدیتی."

سونێ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك، وێ هەستپێکر دووبارە ئەو یا بێهیز و لاوازبووی هەر وەکی کا چەوا هینگێ یا بێهێز بوو دەمێ جووتیاری ئەو هاڤێتیە دناڤ چالا مرنێ دا.  ژ نیشکەکێ ڤە دەنگەك هاتە گوهێن وێ.

- "دادێ، دادێ، ڕابەڤە، ژ خەو هشیار بە."

سونێ چاڤێن خوە ڤەکرن و سەرێ خوە بلندکر، هەلبەت ئەو تشتێ وێ ب چاڤێن خوە دیتی قەت باوەرنەدکر، نە ژبەرکو هێشتا سەرکەسك یێ ساخە، بەلکو وێ دیت سەرکەسك یێ ل ئاسمانی دفڕیت، هەرچەندە ب زۆری یێ پەڕێن خوە دلڤینیت لێ هەر چ نەبیت یێ دفڕیت.

- "ئۆی، ئەڤە چ ل پەڕێن تە هاتیە؟ تو یێ دفڕی؟"
- "بەلێ ئەز یێ دفڕم، ما ئەڤە نە تشتەکێ مەزنە؟"

سەرکەسکی ب کەیفخوەشی و دەنگەکێ بلند ڤە گوتە دایکا خوە: "دەمێ کووشکی هێرش کریە سەر من، ب تنێ من هزرا ڕەڤینێ دکر لێ پاشی پەڕێن من هاریکاریا من کر ئەز بلند ببم و بفڕم."

سونێ زێدەتر نەشیا باخڤیت چونکی هزرکر تشتەك یێ مایە د گەوریا وێ دا، ژبەر هندێ ب تنێ وێ سەرێ خوە هەژارند و گرنژی، ب ڕاستی ژی ئەڤ چەندە حنێرە.

ئەڤە سێیەم حنێرە ئەو ب چاڤێن خوە دبینیت. حنێرا یەکێ ئەو بوو دەمێ ژ قەفەسکێ دەرکەڤتی و ل بن دارا خەرنوٚفێ ڕوونشتیە خوار. حنێرا دووێ ئەو بوو دەمێ ئەو ل سەر هێکەکێ ڕوونشتی و هەمبێزکری، هەلبەت ل وی دەمی ئەو گەلەك یا کەیفخوەش بوو، نوکە وێ حنێرەکا دی ب چاڤێن خوە دیت ئەو ژی کووشك نەشیا سەرکەسکی نێچیر بکەت پشتی کو شیایی بفڕیت و خوە قورتال بکەت.

– "دادێ کا دا سەحکەمە تە، تو بریندار بوویە؟."

سەرکەسکی پەڕێن خوە گرتن و هاتە دەڤ دایکا خوە، سەرەڕای برینێن وێ یێن دژوار لێ سونێ ئەو ب هەموو دلوٚڤانیا خوەڤە هەمبێز کر. وێ دووبارە هەست ب سوٚتنەکێ کر د گەوریا خوە دا ژبەر هندێ وێ ب بهێز دمێ خوە دانا سەر یەك داکو نەکەتە گری.

وەرزێ هاڤینێ ب دوماهی هات و هڕ و بایەکێ هشك هات، هەرچەندە هێشتا تیشکا ڕوٚژێ یا دژوار بوو لێ گولێن لەڤەنان هێدی هێدی دوەریان. چەندین ڕوٚژ بورین و سونێ هەستپێکر ئەو یا ب تنێ یە، چونکی سەرکەسك مژوولی فڕینێ بوو و پتریا دەمێ خوە ل سەر برکا ئاڤێ دبوراند. سونێ ژی بەردەوام دچوو ناڤا زەڤیا لەڤەنان و ب سەر گری دکەڤت داکو تەماشەی وی بکەت دەمێ دفڕیت یان مەلەڤانیان دکەت.

چەندین ڕوٚژ بورین و کووشك دیار نەبوو، دبیت ئەو چووبیتە نێزیکی باخچەی داکو چیچەلوٚکێن مریشکێ بخوٚت یان ژی چووبیتە سەر چالا مرنێ و ل مریشکەکا ساخ و هێشتا نەمری بگەڕیێت. ئەرێ تو بێژی

نوکه ئەوی ب چ چاڤ تەماشەی سەرکەسکی کریە دەمێ ب ئازادی و خوەشی ل ئاسمانی دفڕی هەروەکی ئەو یێ دناڤ باخچەکێ مەزن دا؟

چ پێنەڤێن شیانێن فڕینێ نیعمەتەکا مەزنە، چونکی ڤێ چەندێ گەلەك مفا تێدا هەنە کو یا ژ هەموویێ گرنگتر ئەوە ئێدی ترسا کووشکی ل دەڤ وی نەهێلا. سەرکەسك دشێت د ماوەیەکێ کێم دا ل سەر برکێ هەموویێ بفڕیت و د هەمان دەم دا ئەو دشێت ل ناڤ زەڤیا لەڤەنان بۆ خوە ل جهەکێ ئارام بگەڕیێت داکو لێ بنڤیت.

چیچەلۆکێن مریشکێ بەردەوام دمێ خوە ل ئاخێ ددەن و دکۆلن داکو کرمان بخۆن، لێ سەرکەسك وەناکەت چونکی جیهانا وی ئاڤ و ئاسمانن نەك ئاخ. سونێ تەماشەی سەرکەسکی دکر و هەست ب چاڤپێنەڕابوون و پۆسیدەییێ دکر، هەرچەندە سەرکەسك کوڕێ وێ یە و وێ ئەو یێ ب خوەدان کری لێ هەر ل دوماهیێ ئەو تێشکێ وەردەکەکێ کووڤی یە.

وێ ددلێ خوە دا دگوت: "مە مریشکان پەڕێن خوە ژ دەستدان، ڤێجا ئێدی چ مەزناهی و شانازی تێدایە هەکە ئەم خوە ژ ڕەگەزێ باڵندەیان بهەژمێرین؟ ڕەگەزێ باڵندەیان نەشێن خوە ژ دەستێ نێچیرڤانان قوتال بکەن."

سەرکەسکی ئاگەهـ ژ هندێ نەبوو کو سونێ یا مایە ب تنێ و هەست ب پۆسیدەییێ دکەت چونکی ئەو ب خوە ژی یێ ب تنێ یە و چ هەڤال نینن یاریان دگەل بکەت. دایکا وی مریشکە و نەشێت وەکی وی بفڕیت و ئەو ژی نەشێت وەکی وێ قد قدێ بکەت. ژ لایەکێ دی ڤە هەرچەندە ئەو ژ گەلەك لایان ڤە وەکی وەردەکێن باخچەیە، لێ کەربێن

وان ژ وی ڤەدبن و کەس زوو ب زوو نێزیکی وی نابیت و تێکەلیا وی ناکەت.

ل دەمێ شەڤێ، ئانکو دەمێ هەموو گیاندار دگەل تێشکێن خوە دنڤن، ئەو گونجایترین دەمە ئەو هەردوو هەست ب ئارامی و بەختەوەریێ بکەن. هەردەمێ سەرکەسك ژی ماسیان ب شەڤێ بۆ سونێ دئینیت داکو بخۆت، ئەو هزرا خوە د وەردەکێ کووڤی دا دکەت دەمێ وی ژی ب شەڤێ ماسی بۆ دئینان.

سونێ ئەو شیرەت دکر و دگوتێ: "خوەشتڤیێ من، دڤێت تو بەردەوام گوهێ خوە بدەیە من هەتا خوە دەمێ تو دنڤی ژی چونکی کووشکێ درندە ب درێژاهیا شەڤێ ل ڤان جهان دهێت و دچیت و چ پێنەڤێت ئەو دێ هێتەڤە، ئەو گیانەوەرەکە چ جاران بێ هیڤی نابیت و خوە ب دەست قەدەرێ ڤە بەرنادەت."

سەرکەسکی گوت: "دایکا من یا خوەشتڤی، پێدڤی ناکەت تو نیگەران ببی چونکی پتر دلێ من یێ ب تەڤە ژبەرکو نە تو دشێی بفڕی و نە دشێی مەلەڤانیان بکەی هەکە هات و وی هێرش کرە سەر تە."

سونێ ب گرنژین ڤە گوت: "ئەز هێشتا یا بهێزم و کووشك نەوێریت خوە نێزیکی من بکەت، هەتا ئەو نەشێت لێڤێن خوە یێن پیس ژی نێزیکی من بکەت چونکی ئەو دزانیت ئەز دێ ل بەرامبەری وی ڕاوەستم."

نوکە سونێ هەست ب شانازیێ دکر چونکی سەرکەسك گرنگیەکێ ددەتە وێ و دلێ وی یێ ب وێ ڤە. د دووڤ دا سەرکەسکی گوت: "دادێ من هزرا خوە دکر ...."

پاشی ئەو بۆ دەمەکێ درێژ بێدەنگ بوو، سونێ زانی تشتەکێ نەخوەش یێ چێبووی لەوڕا هەست ب نیگەرانیێ کرەڤە.

— "دادێ، من دڤێت ئەم بچینە دناڤ باخچەی دا بژین چونکی من نەڤێت وەکی کەسەکێ بیانی ب تنێ ل ڤێرێ بژیم."

سونێ ژ نیڤا دلێ خوە خەمگین بوو چونکی ئەڤە یەکەم جارە سەرکەسك داخوازێ ژێ دکەت بچنە دناڤ باخچەی دا، لێ هۆسا دیارە ئەڤە ژ مێژە وەرە ئەو هزرا خوە د ڤێ چەندێ دا دکەت و ئەڤ حەزە ل دەڤ پەیدا بوویە.

— "چەوا؟ ئەم ڤەگەڕینە ناڤ باخچەی؟"
— "بەلێ، چونکی ئەز ب خوە وەردەکم و من ژی دڤێت ویق ویقێ وەکی وەردەکان بکەم."
— "ڕاستە ئەم نە وەکی یەکین، لێ ئەم دشێن حەز ژ هەڤدوو بکەین و ئەز ب خوە ژی گەلەك حەز ژ تە دکەم."

سونێ ئەڤ ئاخفتنە گوتنە سەرکەسکی کو بەری هێنگێ وەردەکێ کووڤی ژی ئەڤ ئاخفتنە گوتبوونە سونێ، ل وی دەمی سونێ د مەرەما وی گەهشتبوو لێ نوکە سەرکەسك د مەرەما سونێ ناگەهیت لەوڕا هەما ب تنێ وی سەرێ خوە دهەژاند.

- "نەخێر دادێ ئەز تێناگەهم، ئەز دترسم سوباهی وەردەکێن باخچەی ڕازی نەبن ئەز وەکی وەردەکەك دگەل وان بژیم، من دڤێت ئەز ژی یەك بم ژ کۆما وان."

پشتی گوتنا ڤان ئاخفتنان، سەرکەسکی دەست ب گریێ کر. ل بەر سونێ ژی بەرزەبوو کا چ بکەت و چەوا سەرکەسکی ڕازی بکەت.

- "خوەشتڤیێ من، هەتا نوکە ژی ئەم یێ ب سلامەتی دژین، تو وەردەکەکێ زیرەکی و تو ب خوە یێ فێری هەموو تشتان بووی بێی کو یەك هاریکاریا تە بکەت وەك مەلەڤانی و نێچیرکرنا ماسیان و فڕینێ."

سونێ دزانی هندی ئەو باخڤیت چ مفا د ئاخفتنا وێ دا نینە، دبیت هۆسا باشتر با ئەگەر وێ هەر ل دەستپێکێ هۆسا سەرەدەری کربا کو وێ ئاگەهـ ژ ئاخفتنێن جووتیاری و هەڤژینا وی نەبوویە. لێ ئەگەر وێ ئەڤ چەندە ژی کربا، ل ڕۆژا پاشتر دا پەڕێن سەرکەسکی هێنە بڕین و ل وی دەمی ئەو دشیا وەك یەك ژ ئەندامێن خێزانا وەردەکان بژیت. یان ژی دبیت باشتر با ئەوێ هێلابا سەرکەسك دگەل سەرکێشێ وەردەکان بچیتە دناڤ باخچەی دا دەمێ داخواز ژێ کری.

- "دادێ، ئەز دزانم تو گەلەك حەز ژ من دکەی، لێ ئەم گەلەك د ژێك جودانە."
- "ڕاستە، لێ ئەم دگەل یەك د بەختەوەرین و من دڤێت هەر وەکی بەری نوکە تو هەر بمینی کوڕێ من."

سەرکەسك ل جهەکێ وێڤەتری دایکا خوە ڕوونشتە خوارێ و ب دلەکێ شکەستی ڤە گوت: "دادێ، من دڤێت تو بزڤڕیە دناڤ باخچەی دا و ئەز ژی دێ گەهمە ڕەڤدەیا وەردەکان."

– "چەوا؟ بزڤڕمە ناڤ باخچەی؟"

سونێ هەستپێکر ها وەختە دێ دلێ وێ ژ جهێ خوە هێتە دەر، لێ وێ نەدڤیا ڤێ تۆڕەبوونا خوە د سەرێ سەرکەسکی دا دەرکەت. وێ ژمێژە دزانی کو جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا وێ و وی دا هەیە، هەر ل وی دەمێ وی خوە ل سەر گول شلێران دهاڤێتی بێی کو بتڕسیت، هەروەسا دەمێ کەڤتیە د ئاڤێ دا و شیایی مەلەڤانیان بکەت. هەر ئەڤ چەندە بوو کو بوویە ئەگەر ئەو هەست ب نیگەرانی و بێهنتەنگیێ بکەت.

سونێ گوت: "ئەز مریشکەکا هێککەر بووم، ل سەر من یا پێدڤی بوو ئەز بمینمە دناڤ قەفەسکێ دا و بەردەوام هێکان بکەم، چ جاران دەلیڤە بۆ من پەیدا نەبوو ئەز هێکەکا خوە هەمبێز بکەم و ل سەر کورك ببم، ل دەمەکی کو ئەڤە مەزنترین هیڤی و خەونا من بوو. دەمێ ب یەکجاری من شیانێن کرنا هێکان ژ دەستدایین، ئەز ژ قەفەسکێ دەرکەڤتم، ل وی دەمی پێدڤی بوو ژیانا من ب دوماهی بهێت، لێ خوەشبەختانە ل وی دەمی من تو دیتی و ئەز بوومە دایك."

سەرکەسك ل جهێ خوە ڕوونشتە خوار و سەرێ خوە کربوو دناڤ پەڕێن خوە دا و چ تشت نەگوتن، ل وی دەمی ڕۆناهیا هەیڤێ ل سەر پێلێن ئاڤێ دبرسقی.

– "خوەشتڤیێ من، مە چ ئەگەر نینن کو بزڤڕینە ناڤ باخچەی، ئەز مریشکەکم و نوکە چ مفا د من دا نینە لێ تو بالندەیەکی و شیانێن تە ژ بالندەیێن ڤێرێ هەموویان پترن."

سونێ خوە نێزیکی سەرکەسکی کر داکو وی بدەتە بەر سینگێ خوە، لێ وی هۆسا خوە دیار دکر کو ئەو یێ د خەوە هەرچەندە ئەو هێشتا یێ هشیاربوو و ئاگەهـ ژ هەموو ئاخفتنێن وێ هەبوو.

نوکە سەرکەسك یێ مەزن بووی و سونێ نەشێت وی ل بن پەڕێن خوە بڤەشێریت خوە هەکە پەڕێن خوە هەموویان ژی ڤەکەت. ب ڕاستی ژی ئەڤ وەردەکێ بچووك گەلەك زوو مەزن بوو. سونێ د دلێ خوە دا گوت: "ئەز نوکە دێ شێم چ کەم؟ کەس ب دووڤ مەڤە نینە هەتا کووشکی ژی بەلا خوە یا ژ مە ڤەکری. نوکە ئەو یێ پێگەهشتی و دشێت بفڕیت لەوڕا ئەو هێدی هێدی یێ ژ من دوور دکەڤیت."

جارەکا دی سونێ هەستپێکر ئەو یا ب تنێ یە و هەتا سپێدی خەو نەچوو چاڤێن وێ. دەمێ دنیا بوویە سپێدە ئەوێ سەرێ خوە نەڕاکر و تەماشەی سەرکەسکی نەدکر دەمێ بەرەڤ برکێ دچووی چونکی ئەو د ترسیا جارەکا دی بێژیتێ دێ چمە ناڤ باخچەی.

سونێ ل سەرێ گری ڕاوەستیا و تەماشەی سەرکەسکی دکر دەمێ مەلەڤانی دگەل وەردەکێن باخچەی د ناڤ برکێ دا دکرن، لێ وان یاریێن خوە ب وی دکرن و ئاخفتنێن نەجوان دگوتنێ و سەرکێشێ وەردەکان ژی هێرشکرە سەر وی. سەرەڕای ئاخفتنێن وان یێن ڕەق و هێرشێن وان، لێ هەر سەرکەسك ما دگەل وان و ژێ دوور نەدکەڤت.

سەرکێشی بەرێ وەردەکێن خوە دا ناڤ باخچەی، سەرکەسکی ژی دا ب دووڤ وان ڤە، ئەڤ چەندە وەکی وی دیمەنی بوو دەمێ سونێ وەردەکێ کووڤی ددیتی کا چەوا دوماهیا هەموو وەردەکان دچیت. سونێ کرە گازی: "خوەشتڤیێ من، بزڤرە، وەرە ڤێرێ."

سونێ دڤیا سەرکەسکی بڕاوەستینیت و نەهێلیت دگەل وان بچیت، لێ ئەو ل دووڤ گازیا وێ نەزڤڕی و یێ بەردەوام بوو ل سەر چوونا خوە دگەل وان. سونێ گوتێ: "ئەز دزانم دناڤ باخچەی ژی دا تو دێ یێ ب تنێ بی چونکی تو وەردەکەکێ زیرەکی و ئەڤ چەندە ب دلێ باڵندەیێن باخچەی نینە و دێ کەربێن خوە ژ تە ڤەکەن."

هێشتا وێ ئاخفتنا خوە تەمام نەکری، سەرکەسک و وەردەکێن دی ل پێش چاڤێن وێ بەرزەبوون.

سونیٚ ل سەریٚ گرەکیٚ بلند ڕاوەستیا بوو و تەماشەی باخچەییٚ مالاٚ جووتیاری دکر. هەموو تشت هیٚشتا وەکی بەریٚ نە و چ نەهاتیە گوهۆڕین. ئەو ڕۆناهیا دناڤ باخچەی و دناڤ کۆلکیٚ مریشکان دا، قەرەبالغا مریشکان، عەرەبانکا دەستی یاکو جووتیاری مریشکیٚن مری و نەساخ دکرنە تیٚدا، دارا خەرنۆڤیٚ و وەردەکیٚن باخچەی ژی هیٚشتا وەکی خوە بوون.

تشتیٚ یەکانە ییٚ دناڤ ڤی باخچەی دا هاتیە گوهۆڕین ئەو ژی پەیدابوونا دیکلەکیٚ نوو بوو لیٚ ئەڤ دیکلە هیٚشتا ییٚ بچووك بوو، لیٚ ئەڤە نە ئەو دیکلیٚ چەلەنگ بوو ییٚ بەری نوکە دناڤ باخچەی دا کو کووشك نەدشیایی وی بگریت.

سونیٚ نەدزانی کا چ دناڤ باخچەی دا ڕوودەت لیٚ ئەو نوکە یا چوویە د هزران دا و یا دئینتە پیٚشچاڤیٚن خوە کا چ تشتیٚ سەیر ل ویٚریٚ ڕوودەت ب تایبەت پشتی چوونا سەرکەسکی بۆ ناڤ باخچەی. دوور نینە نوکە ئەو هاتبیتە دەریٚخستن ژی چونکی سەرکیٚشیٚ وەردەکان نە ییٚ کەیفخوەش بوو ب چوونا وی بۆ ناڤ باخچەی.

– "خوەشتڤییٚ من ییٚ بەلنگاز، نوکە تو د چ ڕەوش دای؟"

ب ڕاستی ژی سونیٚ هیڤی دکرن کو سەرکیٚشیٚ وەردەکان سەرکەسك ژ باخچەی دەریٚخست بیت چونکی ب ڤی ڕەنگی ئەو دیٚ نەچار بیت دووبارە بزڤڕیتە دەڤ دایکا خوە ل نك برکا ئاڤیٚ. ویٚ دزانی کو سەرکەسك هەر دیٚ ییٚ ب تنیٚ بیت ل دەڤ ویٚ، لیٚ ئەو چەندە باشترە ژ هندیٚ بالندەییٚن دی یاریێن خوە پیٚ بکەن. وەکی دی ژی هەر گاڤا وی بڤیٚت دشیٚت ب ئازادی بفڕیت.

دنیا بوو شەڤ و سەرکەسك ژ باخچەی نەهاتە دەرێخستن. وەردەك هەموو ل دور لەگەنا خوارنێ کۆمبوون و سەرێن خوە چەماندن و هەموویان دەست ب خوارنێ کر، لێ سەرکەسکی دگەل وان خوارن نەدخوار چونکی هەڤژینا جووتیاری بۆ وی لەگەنەکا خوارنێ یا تایبەت دانابوو وێرێ.

چ پێ نەڤێت هەڤژینا جووتیاری گەلەك حەز ژ سەرکەسکی دکر و ب هاتنا وی بۆ ناڤ باخچەی یا کەیفخوەش بوو. هەروەسا یا سەیر نینە کو باڵندەیێن دی یێن باخچەی هەموو حەسیدیێ پێ ببەن ژبەر پەڕێن وی یێن ڕەنگاوڕەنگ و تەیسووك و ڕۆخساڕێ وی یێ بالکێش، مادەم هەڤژینا جووتیاری حەز ژ سەرکەسکی کریە، ڕامانا وێ ئەوە سەرکێشێ وەردەکان و دیکلێ باخچەی دێ نەچار بن ڕازی ببن ئەو بمینتە دناڤ باخچەی دا و دگەل وان بژیت.

دەمێ دنیا بوویە سپێدە و پشتی خوارنا تێشتێ هاتیە پێشکێشکرن، وەردەك هەموو ژ باخچەی دەرکەڤتن. سەرکێش ل پێشیا وان بوو و وەردەکێن دی یێن بچووك ژی ب دووڤ وی ڤەبوون، سەرکەسکی دڤیا بدەتە ب دووڤ وان ڤە و پێکڤە بچنە دناڤ برکا ئاڤێ دا، لێ هەڤژینا جووتیاری ئەو گرت و دگەل خوە برە دناڤ باخچەی دا. هندی سەرکەسکی پەڕێن خوە هەژاندن و بزاڤ کر خوە ژ دەستێن وێ بینتە دەر لێ بزاڤێن وی د بێ مفابوون.

دەمێ سونێ ئەڤ دیمەنە ب چاڤێن خوە دیتی، یەکسەر خوە ژ سەرێ گری هاڤێتە خوار و هەست ب ترسێ و نیگەرانییێ کر کا دێ

هەڤژینا جووتیاری چ ل سەرکەسکی کەت. وەردەکێن دی هەمموو بەرەڤ رێکا خوە چوون بۆ ناڤ برکێ و کەس ل پشت خوە نەزڤرِی و هاریکاریا سەرکەسکی نەکر.

هەڤژینا جووتیاری سەرکەسك برە دناڤ باخچەی دا و وەریسکەك ئێخستە پێیەکێ وی و ب ستوونەکێ ڤە گرێدا. وی بزاڤێن مەزن کرن خوە قورتال بکەت لێ ئەڤ چەندە یا بێ مفابوو چونکی ئەو نەدشیا وی وەریسکی بقەتینیت، ژبەر هندێ وی دەست ب گرییێ کر. دەمێ چاڤێ سونێ ب وی کەڤتی یێ دکەتە گری، گەلەك خەمگین بوو و وێ ژی دەست ب گرییێ کر.

وێ رِۆژێ هەممووییێ سەیێ پیر ل دور سەرکەسکی دزڤرِی و زێرەڤانی لێ دکر. سەرکەسکی ژ لاییێ خوە ڤە هندی دهاتێ وی وەریسکی بقەتینیت و ژ باخچەی برەڤیت لێ نەدشیا ڤی کاری بکەت.

سونێ د دلێ خوە دا گوت: "پێدڤی بوو بەری نوکە من گوتباییێ کا بۆچی ئەم ژ باخچەی رەڤین، دبیت ئەو نەچووبایە وێرێ هەکە من گوتباییێ جووتیاری و هەڤژینا وی دڤێت پەرێن تە بقوسینن داکو ئێدی نەشێی بفری. پا ئەز نوکە چ بکەم؟"

سەرکەسکی بریار دا هندی ئەو یێ گرێدایی بیت خوارنێ نەخوت. دیکل و خێزانا خوە بەرەڤ باخچەیێ گیای ڤە چوون و سەیێ پیر ژی د خەو چوو هەتا دنیا بوویە ئێڤار و جارەکا دی وەردەك زڤرِینە ناڤ باخچەی و چوونە سەر جهێن خوە، هۆسا ئەو رِۆژە ب ئارامی بوری.

سونێ بەردەوام ل دەروبەری باخچەی دهات و دچوو و هزرێن خوە دکرن کا ئەو ب چ ڕێك دێ شێت سەرکەسکی قورتال کەت. وێ دڤیا خوە نێزیکی سەرکەسکی بکەت و هەر چ نەبیت دلەکی ل بەر دلێ وی بدەت، لێ سەیێ پیر لێ ڕەوی و گوتێ: "هێشتا تو یا ساخی؟ ئەڤە تو چەند مریشکەکا چەپەڵی!"

سونێ ب تۆڕەیی ڤە تەماشەی وی کر و دڤیا ب دمێ خوە سەروچاڤێن وی بریندار بکەت. سونێ بەرسڤا وی دا و گوتێ: "تە خێرە؟ تو هزردکەی هەما هۆسا ب سانەهی ئەز یا مایمە ساخ؟ باش بزانە من گەلەك نەخوەشی و زەحمەت برینە هەتا ئەز مایمە ساخ، ڤێجا یا باشترە تو خوە نێزیکی من نەکەی."

سەیی ب شکەستن ڤە گوتێ: "هێ هێ مریشکا بەلنگاز، دەنگێ تە گەلەك یێ بلندە و تو یا دفن بلند بووی. تو هزر دکەی چونکی تە تێشکەکێ وەردەکێ یێ ب خوەدان کری دێ جارەکا دی زڤڕیە ناڤ باخچەی ڤە، لێ ئەڤ چەندە خەونە. ئەز زێرەڤانێ ڤی باخچەی مە و هەر گاڤا تو پێنگاڤەکێ خوە نێزیك بکەی دێ تە دەمە بەر لەڤان."

سونێ ل بن دارا خەرنۆفێ ڕوونشتە خوارێ و گازی کرە سەرکەسکی و گوتێ: "خوەشتڤیێ من ئەز یا ل ڤێرە، پێدڤی ناکەت تو بترسی بەلکو دا پێکڤە هزرێن خوە بکەین کا چەوا دێ تە ژ ڤێرێ قورتال کەین."

— "دادێ من ب تنێ نەهێلە ل ڤێرێ، پێ من گەلەك یێ دئێشیت."

بێهنا سونێ تەنگ بوو و نەشیا ڕوونشتی بمینیت لەوڕا جارەکا دی ڕابوو ڤە و ل دور باخچەی زڤڕی داکو چارەسەریەکێ ژبۆ ڤێ ئاریشەیێ

ببينيت. وێ دزانی ژبلی جووتیاری و هەڤژینا وی کەسێ دی نەشێت وی وەریسکی بقەتینیت.

سونێ دهات و دچوو و هزرێن خوە د رێکەکا قورتالکرنێ دا دکرن و ژ نیشکەکێ ڤە بێی کو وێ ئاگەهـ ژ خوە هەبیت سەحکرێ ئەو یا هاتیە دەڤ چالا مرنێ. دەمێ وێ خوە ل دەڤ چالا مرنێ دیتی، ژ ترسان دا تاییێن مرنێ ب سەر گیانێ وێ دا هاتن و ئەڤ چەندە ژی نە تشتەکێ سەیر بوو چونکی وێ دزانی چاڤێ گیانەوەرەکی رك و رك یێ ل وێ، هەلبەت ئەڤ گیانەوەر ژی کووشکە و چ پێنەڤێت نوکە وی چاڤەکێ خوە یێ نقاندی.

وێ پەرێن خوە رەپ کرن و دمێ خوە یێ بهێز تیژ کر و خوین دناڤ رهێن وێ دا ب شێوەیەکێ بلەز دهات و دچوو و وێ خوە بۆ هەر هێرشەکا ژ نیشکەکێ ڤە یا کووشکی بەرهەڤ دکر.

مریشکەکا ساخ دناڤ دەڤێ کووشکی دا بوو و هەر بێهن بێهنە پەرێن خوە دلڤاندن. سەرەرای هندێ کو دنیا یا تاری ژی بوو لێ سونێ ئەو ب باشی ددیت. کووشك هێدی هێدی بەرەڤ وێ ڤە هات، لێ سونێ ژ جهێ خوە نەلڤی چونکی وێ دزانی کووشکی نێچیرا خوە یا گرتی و زیانێ ناگەهینتە وێ.

کووشکی ئەو مریشکا د دەڤێ خوە دا، پشتی کو گیانێ خوە ژدەستدایی، دانا سەر ئەردی و ب کەنیەکا کرێت ڤە گوتە سونێ: "تاما وەردەکێ تە گەلەك یا خوەشە و ل دەمەکێ نێزیك ئەز دێ وی نێچیرکەم و خۆم."

- "کووشکێ پیس، نه هۆسا یا ب سانەهی یە تو بشێی وی نێچیر بکەی هندی ئەز یا ساخ بم."
- "ژ ڕاست؟ نوکە ئەو یێ گرێدایە و پشتی ماوەیەکی دی دێ قەلەو بیت و نەشێت بفڕیت، ل وی دەمی ئەز دێ ب سانەهی وێ نێچیر کەم."

نوکە سونێ زانی کا بۆچی هەڤژینا جووتیاری سەرکەسك گرێدایە، بیرا وێ دهێت کو پەڕێن وەردەکێ کووڤی ژی هاتبوونە قوساندن ژبەر هندێ نەدشیا بفڕیت.

- "و تو مریشکا پیس، چەوا تو دشیایی خوە ل من بدەی و شەڕێ من بکەی؟ ل دەمەکێ نێزیك تو دێ باجا ڤێ چەندێ دەی، ل دەمەکێ نێزیك دێ هەوە هەردووکان نێچیرکەم."

سونێ مەندەهۆش ما ژبەر گەفێن کووشکی. نوکە هاتە بیرا وێ کا ئەو چ پارچەیا گوشتی بوو مایە دناڤ گەوریا وێ دا، هەلبەت ئەو چاڤێ کووشکی بوو.

- "بۆ من باشترە ئەز دناڤ برکێ دا نقووم بم ل شوونا تو من نێچیر بکەی و بخۆی."
- "نەخێر ئەڤ چەندە چێنابیت، چونکی ئەز قەت گیانەوەرێن مری ناخۆم ڤێجا ژبەر هندێ پێدڤیە تو بمینیە ساخ هەتا تو ب چاڤێ خوە دبینی دەمێ ئەز وەردەکا تە یا بچووك نێچیردکەم."

جارەکا دی کووشکی پێ کرە کەنی و دەڤێ خوە هاڤێتە مریشکا خوە یا بەری نوکە نێچیرکری و دناڤ تاریاتییێ دا بەرزەبوو، بەرێ سونێ ما

ل وی و لەشێ وێ ژ ترسان دا دلەرزی چونکی هەر ژ نوکە کووشکی دیمەنێ مرنا وێ یا بێ ئیفلەح ئینا پێش چاڤێن وێ. سونێ چالا مرنێ بجهـ هێلا، لێ هێشتا ئاخفتنێن کووشکی یێن د گوهێن وێ دا دەنگ ڤەددەن.

سونێ د دلێ خوە دا دگوت: "تو بێژی کووشك بشێت بچیتە دناڤ باخچەی دا؟ بەلێ سەیێ پیر زێرەڤانییێ دکەت و هەردەمێ کووشك نێزیکی وێرێ بوو دێ ڕەویت و دەتە ب دووڤ ڤە، پاشی باڵندەیێن باخچەی ژی هەمموو دێ کەنە هەوار و جووتیار دێ ل دووڤ دەنگێ وان دەرکەڤیت. هەکە خو کووشك خوە بگەهینتە سەرکەسکی ژی ئەو نەشێت وی دگەل خوە ببەت چونکی یێ گرێدایە."

دیسان وێ گوت: "خۆزی جارەکێ ب تنێ و بۆ چرکەکێ هەڤژینا جووتیاری قەیدێن سەرکەسکی ڤەکربان چونکی ئەو دا یەکسەر خوە ژ دەستان ئینتە دەر و فڕیت. لێ هەکە ئەو هەر ما گرێدایی دێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ قەلەو بیت و شیانێن خوە یێن فڕینێ ژ دەست دەت."

شەڤا پاشتر ژی کووشك ل دەڤ چالا مرنێ دیاربوو، هۆسا دیارە ئەڤ شەڤە وی چ نێچیرین ساخ نەگرتینە ژبەر هندێ بەرێ خوە دا باخچەی بەلکو نێچیرەك ل وێرێ هەبیت. ل وی دەمی دیکلێ بچووك دناڤ باخچەی دابوو و دچەری.

سونێ ب باشی تەماشەی کووشکی دکر و وی ژی دزانی سونێ یا زێرەڤانییا وی دکەت، ژبەر هندێ ل پشت خوە زڤڕی و ب ناڤ چاڤێن گرێ

ڤە تەماشەی وێ کر و دڤیا بێژیتێ: باش زێرەڤانیا من بکە چونکی ڕۆژەك دێ هێت هۆسا ئەز ژی دێ زێرەڤانیا تە کەم و تە نێچیر کەم.

سونێ ڕەپ ڕاوەستیا و مەندەهۆش ما چونکی هۆسا دیارە کووشکی ل بەرە دیکلێ بچووك نێچیر بکەت. سونێ دڤیا بکەتە هەوار داکو دیکلێ بچووك ل پشت خوە بزڤڕیت و بڕەڤیت، لێ هندی هاتێ دەنگێ وێ نەدەرکەڤت. سەیێ پیر ژی ئاگەهـ ژ چ تشتان نەبوو چونکی نوکە یێ ب ناڤسال ڤە چوویی و ئێدی وەکی بەرێ گوهـ ل دەنگان نینە و بێهنا چ تشتان ژی زوو ب زوو ناچیتێ.

ل وی دەمی، سونێ ب هەموو هێزا خوە ڤە کرە هەوار، ب ڕاستی ژی وێ ڤێژیەکا بلند ڤەدا و هەر یەکسەر سەیێ پیر ژی ل دووڤ دەنگێ ڤێژیا وێ هشیاربوو و دەست ب ڕەوینێ کر، لێ مخابن هەموو ڕوودان گەلەك بلەز برێڤە دچوون. کووشکی بلەز خوە ژ وێرێ دوورکر پشتی کو دیکلێ بچووك نێچیر کری.

دەنگێ ڕەوینا سەی بوو ئەگەر هەموو باڵندەیێن باخچەی هشیار ببن و بهێنە ژ دەرڤە، ل دووڤ دا جووتیار و هەڤژینا خوە ژی دەرکەڤتن. دیکلێ بچووك ئێدی بۆ هەتا هەتایێ بەرزەبوو، دیکلێ مەزن و مریشکێ دەست ب قدقدێ کر و ل زارۆکێ خوە یێ بچووك دگەڕیان، هەروەسان وەردەکان ژی دەست ب ویق ویقی کر. ل ڤی دەمی چاڤێ سەرکەسکی ل ڤان دیمەنان بوو و مەندەهۆش ما ژبەر وی تشتێ هاتیە ڕوودان.

جووتیاری گوت: "نەفرەت ل کووشکی بن، هۆسا دیارە وی جارەکا دی ژی یا خوە نێزیکی ڤێرێ کری؟"

هەڤژینا جووتیاری مژوولی زڤڕاندنا باڵندەیان بوو بۆ ناڤ جهێن وان، پاشی وێ بەرسڤا هەڤژینێ خوە دا و گوت: "ئەم پێدڤی ب سەیەکێ بهێز و گەنجین، سەیێ مە یێ نوکە یێ پیر بووی و هەکە ل سەر ڤی دەست و داری بیت دوور نینە ل دەمەکێ نێزیك هەموو باڵندەیێن مە یێن باخچەی بهێنە نێچیر کرن."

جووتیاری ب تۆڕەیی ڤە گوتە هەڤژینا خوە: "تو ب دەستێن خوە یا داخوازێ ژ کووشکی دکەی بهێتە ناڤ باخچەی دا و ڤی وەردەکێ نێچیر بکەت، چەوا تە ئەو هۆسا ل ناڤ باخچەیی و ل جهەکێ بەردایی گرێدایە ژبەرکو ب ڤی ڕەنگی تە خوارنا کووشکی یا دانایە بەر سینگێ وی. هەر نوکە ڤی تێشکێ وەردەکان ببە دناڤ کۆلکی دا."

هەڤژینا جووتیاری نەفرەت ل سەیێ پیر دکرن و بەرەڤ سەرکەسکی ڤە چوو. سونێ بەردەوام زێرەڤانییا هەڤژینا جووتیاری دکر و چاڤێ وێ باش لێ بوو دەمێ وێ ڤەیدێن وی ژ ستوونێ ڤەکرین.

ب تنێ پێیەکێ سەرکەسکی ب وەریسکی ڤە یێ گرێدایی بوو، لەوڕا دەمێ هەڤژینا جووتیاری ئەو ل دووڤ خوە ڕادکێشایی، ئەو دلەنگی. ئەگەر هەڤژینا جووتیاری وی ببەتە دناڤ کۆلکی دا و گرێدەت، ئێدی ب چ ڕەنگان سونێ نەشێت وی ببینیت، ژبەر هندێ ب هەموو هێزا خوەڤە وێ خوە بلند کر و گوت: "بەلا خوە ژ زارۆکێ من یێ بچووك ڤەکە و وی بهێلە ب تنێ."

دەمێ هەڤژینا جووتیاری سەرێ خوە بلند کری، وێ هۆ دیت مریشکەکێ خوە ب پەڕڤە ل ناڤ چاڤێن وێ دا. سونێ هۆسا پەڕێن خوە

لێككدان خو دا بێژی ئەو دیكلەكێ شەڕكەرە. وێ ب دژواری ناڤ چاڤێن هەڤژینا جووتیاری بریندار كرن.

هەڤژینا جووتیاری كرە گری و گوت: "هەوارە ئەڤ مریشكا چەپەڵ دێ من كوژیت."

دووبارە وەردەكێن باخچەی دەست ب ویق ویقێ كر و قەرەبالغەكا مەزن ب سەر باخچەی دا چوو، هەڤژینا جووتیاری دڤیا بەرەڤانییێ ژ خوە بكەت و سونێ ژ خوە بدەتە پاش، لێ ژ نیشكەكێ ڤە ئەو وەریسكێ پێ سەركەسكی گرێدایی ژ دەستێن وێ دەركەڤت.

هەر یەكسەر سەركەسكی پەڕێن خوە یێن ب هێز ڤەكرن و فڕی، ئەو وەریسكێ ب پێ وی ڤە هاتیە گرێدان ژی دگەل وی بلند بوو، وەردەكێن دی یێن باخچەی ب حێبەتی ڤە تەماشەی وی دكر چونكی ب چ ڕەنگان ئەو نەدشیان هۆسا وەكی وی بفڕن.

سونێ ژی ڕەڤی و ڤیا ژ باخچەی دوور بكەڤیت، لێ هەڤژینا جووتیاری دەست هاڤێتە گێسكێ ماڵێنێ و د وێ وەركر، پیچەك مابوو گێسك وێ بكوژیت لێ ئەو ل دوماهیێ شیا خوە قورتال بكەت و ژ وێرێ دوور بكەڤیت.

ڕێكا بەرەڤ بركێ گەلەك یا تاڕی و دوور بوو، لێ ئێدی چ تشت پێدڤی ترسێ و نیگەرانییێ ناكەن مادەم سەركەسك ژ دەستێن هەڤژینا جووتیاری قورتال بوو. هەروەسا ل ڤی دەمی ئەو ژ هاتنا كووشكی نەدترسیا چونكی وی بەری نوكە دیكلێ بچووك یێ نێچیر كری و چ پێنەڤێت نوكە برسا وی پیچەكێ داهاتیە.

سونێ د دلێ خوە دا دگەل سەرکەسکی دئاخفت و دڤیا بێژیتێ: "خوەشتڤیێ من نوکە تو فێری تشتەکێ نوو بووی، هزر نەکە وەردەکێن باخچەی یەکسەر دێ حەز ژ تە کەن چونکی تو ژ نفشێ وانی، بەلکو یا گرنگتر ئەوە بزانی ئەو کەس دێ حەز ژ تە کەن یێن د تە دگەهن و تو د وان دگەهی خوە هەکە ژ ڕەگەزێ تە ژی نەبن."

نوکە سونێ ژ هەموو دەمێن بوری لاوازترە و هەر تشتێ دکەڤیتە بەر سینگێ وێ دخوار داکو برسا خوە پێ بشکێنیت. نوکە ئەو هزردکەت ئەو ژی وەکی باڵندەیێن ئاوازخوین یێن دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا یا بچووك بووی. هەلبەت لاوازیا وێ یا نوکە بۆ هندێ دزڤڕیت کو وێ هەموو هێزا خوە ژ بۆ قورتالکرنا سەرکەسکی بکارئینا بوو.

پشتی سەرکەسك ژ باخچەی دورکەڤتی، ئێدی ب تنێ دنڤست، ئانکو ب شەڤێ ئەو نەدچوو دەڤ سونێ و ب ڕەخ وێ ڤە نەدنڤست. ئەوی پتریا دەمێ خوە دناڤ برکێ دا دبوراند و مەلەڤانی دکرن. سونێ ژی ژ دوور ڤە زێرەڤانییا وی دکر لێ وێ نەدزانی کا ئەو ب شەڤێ ل کیڤە دنڤیت.

دەمێ جارەکێ سونێ جهێ نڤستنا وی دیتبا ژی، ب تنێ دا ژ دوور ڤە تەماشەی وی کەت، ئەو نوکە نەشێت وەکی بەرێ خوە نێزیکی وی بکەت یان وی هەمبێز بکەت. تشتێ یەکانە یێ وێ دڤیا ژێ پشتڕاست ببیت ئەو بوو کو دڤیا بزانیت کا سەرکەسك ب شێوەیەکێ باش نڤستییە یان نە.

سونێ هەست پێ دکر ئەو یا مایە ب تنێ و کەسێ خوە نینە، لێ پێدڤیە ئەو ڤێ چەندێ ل بەر چاڤ وەربگریت و ل دەڤ وێ تشتەکێ

ئاسایی بیت چونکی ل دوماهیێ ئەو نە یەك ژ نقشێ مریشکانە و هەر یەکی ژیانا خوە یا تایبەت هەیە.

سونێ دڤیا هەر چ نەبیت هاریکاریا وی بکەت و وەریسکێ ب پێ وی ڤە بقەتینیت چونکی چەند جارەکا ئەو دفڕیت یان مەلەڤانیان دکەت ئەڤ وەریسکێ ب پێ وی ڤە نەخوەشیێ دگەهینتێ. هەلبەت ئەڤ چەندە دیمەنەکێ خەمگینە، سەرکەسك ژی هەست ب نەخوەشیێ دکەت ژبەر وێ پارچەیا وەریسکی.

سەرکەسکی نەدڤیا ئێدی سونێ نێزیکی وی ببیت، لێ سەرەڕای ڤێ چەندێ سونێ بەردەوام ب دووڤ وی ڤەبوو و ل جهەکێ نێزیکی وی دنڤست داکو بەردەوام ئەو ل پێش چاڤێن وێ بیت و وێ هەست ب ئارامی و بەختەوەریێ دکر دەمێ وێ سەرکەسك ل نێزیکی خوە ددیتی.

هندەك جاران کووشك ل وان جهان دهات و دچوو و ل نێچیرەکێ دگەڕیا، لێ ڤێ چەندێ چ ڕوودانێن خەمگین پەیدا نەدکرن چونکی ئەو نەشیا چ گیانەوەرێن دی یێن لاواز نێچیر بکەت.

سەرکەسکی هەستەکا بهیستنێ یا بهێز هەبوو، ژبەر هندێ هەردەمێ کووشکی ب دزیکی ڤە خوە نێزیکی وی کربا، وی هەست ب دەنگێ خوە خشاندنا وی ل سەر ئەردی دکر و یەکسەر دا فڕیت. وی ئەڤ چەندە دگەل سونێ ژی دکر.

وەرزێ پاییزێ هەموو ب ڤی شێوەی بوری.

سونێ چوو دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا و چاڤێ وێ ب هژمارەکا مێشومۆران کەڤت ب تایبەت سەرتەشیکان کو وان دادا بوو سەر هندەك

شینکاتییێن ئاڤی و هێکێن خوە ل سەر دانابوون و تا ڕادەیەکی د وەستیایی بوون دا بێژی ئەڤە دوماهیك جار بوو ئەو فڕین.

چاڤێن ڤان سەرتەشیکان د ڤەکری بوون و وان دزانی سونیێ یا بەرەڤ وان دچیت، لێ بێی کو ئەو بترسن یان بەرەڤانییێ ژ خوە بکەن، دمانە ل سەر جهێن خوە و سونیێ ژی ب دلێ خوە ئەو دخوارن. هەرچەندە ڤان مێشومۆرێن بچووك برسا سونیێ نەدشکاند لێ دەمێ چ خوارن ب دەست وێ نەکەڤتبایە ئەو دا نەچار بیت ڤان مێشومۆران بخۆت.

ئێدی ڕۆژ زووتر دچوو ئاڤا، ژبەر هندێ ئێدی وەردەکان ژی زووتر برکا ئاڤێ بجهـ دهێلا و بەرەڤ باخچەییێ مالێ دچوون، پشتی چوونا وان ژبلی دەنگێ بای و لڤینا گیای چ دەنگێن دی ل وێرێ نەدهاتن و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ سەرمایا پاییزێ ژی دژوارتر لێ دهات. ل وی دەمی، سەرکەسك دا وی وەریسکێ درێژ یێ ب پێ وی ڤە ل دووڤ خوە کێشیت و دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا بۆ خوە ل جهەکی گەڕیت بۆ نڤستنێ و سونیێ ژی ب دزیکی ڤە ب دووڤ وی ڤە بوو.

ڕۆژەکێ سپێدە زوو بوو، هڕ و بایەکێ بهێز هات و ئەو چەقێن لەڤەنان هەموو لڤاندن. سونیێ لەرزی و هەست ب مەترسییێ کر ب تایبەت دەمێ وی بایێ تەزی پەڕێن وێ لڤاندین.

سونیێ پرسیار ژ سەرکەسکی کر: "تو یێ ب سلامەتی خوەشتڤیێ من."

هەرچەندە سونیێ نە هند یا ژ سەرکەسکی دوور بوو لێ هەر دلێ وێ پێڤەبوو، دترسیا نەکو تشتەك لێ هات بیت. سەرکەسکی هەست ب

مەترسیێ دکر و چەندین جاران ل دور خوە زڤڕی، پاشی بلەز فڕی و ب دەنگەکێ بلند ڤە کرە هەوار: "دادێ دادێ، هشیاری خوە بی."

سونێ هەست ب مەترسیەکا مەزن کر چونکی کووشك نێزیکی وێ بوو. سەرکەسك ژی ل هنداڤ وان ل ناڤ زەڤیا لەڤەنان دزڤڕی و بەردەوام ویق ویق دکر. پاشی گوتە سونێ: "هشیاری خوە بی، ئەڤ جارە ئەو یێ ب تنێ نینە بەلکو سێ کووشکێن دی ژی یێن دگەل وی."

سونێ مەندەهۆش ما و نەزانی دێ چ کەت، ب ڕاستی ژی ڤێجارێ مافێ وێ یە بترسیت چونکی بەری نوکە کووشکەك ب تنێ بوو وێ چ خوەشی و ئارامی ژبەر وی نەبوو، پا نوکە سێ کووشکێن دی ژی هاتنە هاری وی ڤێجا تە دڤێت ئێدی ژیانا وێ بکەڤیتە د چ مەترسی دا.

سونێ ژناڤ زەڤیا لەڤەنان دەرکەڤت و گەلەك یا هشیاری خوە بوو، وێ هزر دکر ئەو قورتال بوو، لێ هەر زوو کووشك کەڤتە بەر سینگێ وێ و بەرامبەر وێ ڕاوەستیا. وێ هەست ب ترسێ کر دەمێ کووشکی ب چاڤێ خوە یێ یەکانە ب تۆڕەیی ڤە تەماشەی وێ دکر.

کووشکی گوت: "پشتڕاست بە ئەز نوکە تە ناخۆم چونکی ب تنێ ل وی دەمی دێ تە نێچیرکەم دەمێ چ تشتێ ب کێر خوارنێ بهێت نەمینیت."

پاشی ئەو هێدی هێدی ژ سونێ دوور کەڤت و پێ دکرە کەنی.

سونێ ل پشت خوە زڤڕی و بەرسڤا وی دا: "پشتڕاست بە تو نەشێی زارۆکێ من ژی نێچیرکەی چونکی تو نە نێچیرڤانەکێ چەلەنگی و تە باوەری ب شیانێن خوە نینە. بۆ تە جهێ شەرمزاریێ یە پشتی تو نەشیایی

وی نێچیر بکەی تو چووی سێ گیانەوەرێن دی بینیە هاری خوە. لێ ئەز تە پشتڕاست دکەم تو چ جاران نەشێی وی بگری. سەحکێ ئەو یێ ل ئاسمانی و بلند دفڕیت، پێدڤی بوو تە باش ئەو دیتبا بلا هەر تو یێ ب چاڤەکێ ب تنێ بای."

کووشك ل پشت خوە زڤڕی و هەست ب تۆڕەبوونەکا مەزن کر و ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن، لێ پاشی بەردەوامی دا چوونا خوە و هێرش نەکرە سەر وێ. کووشکی گوتێ: "نوکە وەرزێ نێچیرێ یە و ل دوماهیێ ئەو تشتێ ئەڤە ئەم هەیامەکە ماینە ل هیڤیێ دێ ل ڤان نێزیکان نێچیرکەین."

ئاسمان یێ پڕ بوو ژ ئەوران، چەقێن لەڤەنان ژی ژبەر هڕ و بایێ بهێز خوار ببوون، پشتی نەمانا بای، هێدی هێدی ڕاست دبوونە ڤە. هەلبەت ڤی هڕ و بای کارتێکرنەکا ڕۆهن و ئاشکەرا ل سەر ئەردی هەبوو و گەلەك لەڤەن شکاندبوون، دیارە ئەڤە هێمایەکە بۆ ڕوودانا تشتەکێ نەئاسایی.

سونێ گوهـ ل دەنگەکی بوو، سەرکەسك ل دور برکێ دزڤڕی و ب دەنگەکێ بلند ل ئاسمانی گازی وێ دکر و پاشی هاتە دەڤ وێ و ڕوونشت، ئەڤە ماوەیەکێ درێژە ئەو نەهات بوو دەڤ وێ.

سەرکەسکی گوتێ: "دادێ، ئەز یێ هەست ب تشتەکێ سەیر دکەم، بەری نوکە چ جاران من هەست ب تشتێن هۆسا نەکریە، چ پێنەڤێت تشتەکێ مەزن دێ ڕوودەت."

– "تە چیە خوەشتڤیێ من؟ تو ژ ڤان گیانەوەرێن دڕندە دترسی؟"

- "نەخێر دادێ، مەرەما من ئەو چەندە نینە؟"
- "ئەرێ پا تشتەکێ ژ هندێ خراپتر و مەترسیدارترە؟"
- "دادێ ئەڤە تشتەکێ جودایە، ڤی تشتی ئاسمان هەموو یێ نخافتی، ما تو هەست پێ ناکەی؟"
- "مەرەما تە چیە خوەشتڤیێ من؟"

سونێ هەست ب پۆسیدەییێ دکر چونکی ئەو نزانیت کا سەرکەسکی چ تشت ب چاڤێن خوە دیتیە یان ژی چ گوهلێبوویە.

سەرکەسکی کرە هەوار: "گوهێ خوە بدە ڤی دەنگی، دەنگەکێ گەلەك بهێزە. سەحکێ ئەو بڕەکا مەزن یا باڵندایە."

تشتەکێ نوو و نەدیار هێدی هێدی نێزیکی وان دبوو. سونێ هەست ب نیگەرانییێ دکر دەمێ وێ گوهداریا وی دەنگی دکری یێ سەرکەسکی بەحس ژێ دکر. هەر زوو دەنگەك هاتە گوهێن وێ کو بەری نوکە وێ گوهـ ل ڤی دەنگی نەبوویە. یا دیارە ئەڤ دەنگە ژ جهەکێ دوور ل پشت چیایی دهێت.

هێدی هێدی دەنگ بلند بوو و ژ دوور ڤە هژمارەکا گەلەك مەزن یا خالێن ڕەش ل ئاسمانی دیاربوو. هەر یەك ژ ڤان خالێن ڕەش باڵندەیەك بوو. ئاسمان ب هژمارەکان مەزن یا ڤان باڵندەیان هاتبوو نخافتن و دەنگەکێ بلند ژ وان دچوو، ژبەر هندێ سونێ ژبلی دەنگێ وان ئاگەهـ ل چ تشتێن دی نەبوو.

ئەو ڕەڤدەیا باڵندەیان هەمموو هاتنە سەر برکا ئاڤێ و یەك یەکە دادانە سەر ئاڤێ. سونێ و سەرکەسك هەردوو گەلەك مەندەهۆش مان و چاڤێ وان ڕك ما ل ڤان باڵندەیان.

سونێ ب خوەشحالی ڤە گوتە سەرکەسکی: "سەحکێ، ئەڤە جارەکا دی خێزانا تە زڤڕی ڤێرێ."

بەری نوکە سونێ چ جاران باڵندەیێن ب ڤی ڕەنگی نەدیتبوون، لێ چ پێنەڤێت ئەڤە ئەو باڵندەنە یێن کو وەردەکێ کووڤی مایە ل هیڤیا وان. ئەو بەردەوام داچیتە سەر گرەکێ بلند و تەماشەی جهێن دوور کەت. وی بەردەوام هەست پێ دکر ئەو یێ مایە ب تنێ چونکی وی خێزانەکا هۆسا مەزن ژدەستدابوو.

سەرکەسکی گوت: "دادێ، دلێ من خوە گەلەك بلەز یێ دقوتیت، ئەز نزانم بۆچی وەل من هات؟"

پاشی سەرکەسکی سەرێ خوە برە دبن پەڕێن سونێ ڤە هەروەکی کا چەوا دەمێ ئەو یێ بچووك ژی ئەڤ چەندە دکر. بەرامبەر ڤی دیمەنێ نەیێ چاڤەڕێکری، سەرکەسکی هەست ب مەترسیێ دکر.

سونێ پێ کرە کەنی و بەرسڤا وی دا: "خوەشتڤیێ من ئەڤ چەندە تشتەکێ ئاسایی یە، چونکی بەری نوکە تە چ دیمەنێن هۆسا یێن جوان نەدیتینە ژبەر هندێ دلێ تە بلەز یێ خوە دقوتیت.

سونێ هەستپێکر نوکە ئەو یا هەست ب بەختەوەریێ دکەت خوە دا بێژی وێ جارەکا دی وەردەکێ کووڤی دیت. پاشی وێ د دلێ خوە دا گوت: "ئاها نوکە ئەز د هەمموو تشتان گەهشتم ئەی هەڤالێ من یێ خوەشتڤی."

بەری نوکە وەردەکێ کووڤی داخواز ژ سونێ کربوو دگەل سەرکەسکی بچیتە دەڤ برکا ئاڤێ نەك بزڤڕیتە ناڤ باخچەی. سونێ هینگێ هزرکر ئەو دزانیت کا بۆچی وەردەکی ئەڤ داخوازە ژ وێ کربوو لێ ب ڕاستی ژی ئەو هزرا سونێ دکری یا شاش بوو چونکی نوکە ب دروستاهی دیاربوو کا مەرەما وی چ بوو. وەردەکێ کووڤی دڤیا تێشکێ وی ل ڤی جهی مەزن ببیت و بگەهیتە خێزانا خوە.

سونێ پەڕێن خوە ڤەکرن و سەرکەسك دا بەر سینگێ خوە کو نوکە یێ مەزن بووی و پێگەهشتی و بوویە وەردەکەکێ تەمام. وێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ئەو دا بەر سینگێ خوە و تێر بێهن کرە پەڕێن وی.

دبیت جارەکا دی دەلیڤەیەکا هۆسا بۆ وێ پەیدانەبیت کو تێر سەرکەسکی بدەتە بەر سینگێ خوە، چونکی تشتێن پڕبها بۆ ماوەیەکێ درێژ نامینن و زوو دچن. سونێ ژی ئەڤ چەندە باش دزانی، ژبەر هندێ یا ل سەر وێ پێدڤی بوو بیرا خوە ل هەموو تشتان بینیت چونکی ل دوماهیێ هەموو تشت دچن ب تنێ بیرهاتن دمینن.

وەردەكێ كووڤی د بۆچوونا خوە دا یێ ڕاست بوو دەمێ دگوتی ئەڤ كووشكە تا ڕادەیەكی ژ كووشكێن دی یێن نفشێ خوە مەزنتر و بلەزترە. ئەڤ كووشكە هەتا بۆ نێچیركرنێ ژی گەلەك یێ شارەزا و بیرتیژ بوو لێ هندەك جاران دگەل هندەك كووشكێن دی پێكڤە كۆمەكێ پێكدئینن و پێكڤە دەست ب نێچیرێ دكەن.

پشتی هاتنا ڕەڤدێن مەزن یێن وەردەكێن كووڤی بۆ سەر بركێ، ئێدی كووشكان بەردەوام ستێركا خوە ل وان دگرت و هەر دەلیڤەیەكا گونجایی بۆ وان هەلكەڤتبایە دا نێچیركەن. پتریا جاران وان ئەو وەردەكێن بچووك نێچیر دكرن یێن ژ هەڤالێن خوە دوور دكەڤتن یان ژی ئەو وەردەكێن بۆ یەكەم جار هاتینە وێ دەڤەرێ و ل وان جهان شارەزایی نەی.

گشت وەردەكێن كووڤی وەك كۆمەكا یەكگرتی یا بهێز پێكڤە دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا دنڤستن و پێكڤە مەلەڤانی دكرن. دەمێ سەركێشێ وان دەست ب فڕینێ كربا، ئەو هەمووو پێكڤە دا دەنە ب دووڤ وی ڤە و قەرەبالغەكا مەزن ل وی جهی پەیدا دكر.

ل ڤی دەمی، سەركەسكی ژی سونێ بجهـ هێلا و چوو دگەل وان، لێ ل دەستپێكێ وان پێشوازیا وی نەكر و ڕوویێ خوە ل وی ڤەنەكر. هەرچەندە ئەو دناڤ باخچەیێ مالا جووتیاری دا مەزن نەبوویە و ب چ ڕەنگان وەكی وان وەردەكێن كەهی نینە یێن دناڤ باخچەی دا دژیان، لێ ئەگەرێ خوە دووركرنا وەردەكێن كووڤی ژ وی بۆ هندێ دزڤڕی كو هێشتا ئەو پرتا وەریسكی یا مایە ب پێ وی ڤە و ڤێ چەندێ ژی گۆمان بۆ وەردەكان

دروست كربوو كو ئەو يێ دگەل مرۆڤان ژيايى و پاشى يێ ژ جهێ وان ڕەڤى.

ژ لايەكێ دى ڤە سونێ ئەو گر بجهـ نەهێلابوو، چونكى ل وى دەمى وێ كۆما كووشكان چ زيان نەدگەهاندێ و ب تنێ ئەو مژوولى نێچیركرنا وەردەكێن كووڤى بوون و وان سونێ ب پشتگوهڤە هاڤێتبوو. هەلبەت وێ چ جهێن باشتر ژ ڤى گرى نەديتن كو لێ بمينيت و تەماشەى زەڤيا لەڤەنان و ڕەڤدەيا وەردەكێن كووڤى بكەت.

سەركەسكى هەموو هێز و شيانێن خوە دمەزاختن ژ پێخەمەت هندێ ببيتە يەك ژ ئەندامێن ڤێ ڕەڤدەيا وەردەكان، سەرەڕاى كو وەردەك هەموو ژ وى دوور دكەڤتن، لێ وى بەردەوام بزاڤ دكرن ب دووڤ وان ڤە بيت و دگەل وان بفڕيت يان ژى ب ڕەخ وان ڤە بنڤيت. هندەك جاران ژى ئەو نەچار دبوو ل جهەكێ دوورى وان بمينيت ب تايبەت دەمێ وان چ پيتە ب وى نەدكرى.

دلێ سونێ گەلەك دما ب سەركەسكى ڤە دەمێ دديتى ئەو ل جهەكێ دوور ژ وەردەكان يێ ڕوونشتى يان ب تنێ مەلەڤانيان دكەت و كەس تێكەلييا وى ناكەت، لێ مخابن ئەو نەشێت هاريكارييا وى بكەت و وى ژ ڤێ ئاريشەيێ قورتال بكەت.

سونێ هەموو گاڤان هزر دكر كو سەركەسك باڵندەيەكێ خوەدان شيان و يەكانەيە. هەلبەت ئەو يێ ب ڤى ڕەنگى بوو دەمێ دگەل وەردەكێن ناڤ باخچەى دهاتە هەڤبەركرن، لێ سەركەسك نەدشيا وەكى وەردەكێن كووڤى ب شێوەيەكێ باش و بلەز بفڕيت و تا ڕادەيەكى ژ وان هێديتر بوو،

هەر ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر دەمێ دگەل وان دفڕی ل دوماهیێ بمینیت و گیرۆ ببیت.

دەمێ چاڤێ سونێ ب وی دکەڤتی، د دلێ خوە دا دگوت: "چ پێنەڤێت ئەو ژبەر وی وەریسکێ ب پێ وی ڤە نەشێت بلەز بفڕیت، خۆزی ئەو شیابا وی وەریسکی ژ پێ خوە ڤەکەت."

سونێ فێری هندێ ببوو بەردەوام دمێ خوە ل وان کۆمێن پیشی ددا یێن کو د بەربەلاڤ دناڤا زەڤیێن برنجی یێن هشك دا و وێ ئەو دنکێن برنجی یێن دکەڤتنە سەر ئەردی دخوارن، پشتی هینگێ ئەو دا چیتە د وێ چالێ دا یاکو دناڤا وێ شکەڤتا ل سەرێ گری دا بۆ خوە کۆلای. د وێ چالێ دا وێ هەست ب ئارامی و گەرماتییێ دکر خوە هەکە سەقا یێ تەزی ژی بایە. هەردیسان ل وێرێ ئەو دشیا زێرەڤانییا کۆما کووشکێن مێ بکەت دەمێ دچوونە دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا و ژێ دەردکەڤتن.

— "چ پێنەڤێت ئەو یێ پیلانێ بۆ کارەکێ ب مەترسی ددانن."

پشتی بارینا بەفرێ، کووشکێن مێ نەدشیان ئێدی گەلەك وەردەکان نێچیر بکەن ژبەرکو بەری هینگێ ئەو شیابوون پتریا وان وەردەکێن بچووك و لاواز نێچیر بکەن، لێ نێچیرکرنا وەردەکێن مەزن و بهێز کارەکێ هۆسا ب سانەهی نەبوو.

هەرچەندە کووشکان ب لەزاتیەکا مەزن دا ب دووڤ وەردەکێن کووڤی ڤە، لێ گەلەك یا ب زەحمەت بوو ئەو بشێن وەردەکەکا ب تنێ ژی نێچیر بکەن، دەمێ جارەکێ بەختێ وان یێ سپی با و وان وەردەکەکا مەزن

نێچیر کربا، دا ئەو ب خوە دا ب هەڤدوو وەرهێن و شەڕی کەن چونکی هەر یەکی دڤیا بۆ خوە پارچەیەکا مەزن ڕابکەت.

ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر دوو ژ کووشکان وێ دەڤەرێ بجهـ بهێلن و بچنە جهەکێ دی نێچیرێ بکەن، لێ کووشکێ ب چاڤەکی و هەڤالەك ب تنێ مانە ل وێرێ و پێکڤە نێچیر دکرن.

سونێ بەردەوام یا نیگەران بوو و دترسیا چونکی سەرکەسك هەموو گاڤان ل دووری وی جهی دنڤیت یێ ڕەڤدەیا وەردەکان پێکڤە لێ دنڤن، ئەڤ چەندە ژی هندێ دگەهینیت کو ئەو ئارمانجا دەستپێکێ یە ژ بۆ هێرشێن کووشکان، هەروەسا ڕاکێشانا وێ پارچەیا وەریسکی ل دووڤ خوە کارەکێ گران و نەخوەشە.

سونێ هۆسا د دلێ خوە دا دئاخفت خوە دا بێژی سەرکەسکی گوهـ ل وێ هەیە: "خوەشتڤیێ من سەرکەسك، هیڤی دکەم ئەڤ شەڤە نەنڤی، چونکی ئەڤە دوو ڕۆژە کووشکی چ تشت نەخوارینە و نوکە گەلەك یێ برسی یە."

سونێ ل سەرێ گری ڕاوەستیا و ب هشیاری زێرەڤانی ل کووشکی و هەڤالا وی دکر کو خوە ل پشت زەڤیا لەڤەنان ڤەشارتبوون، ل وی دەمی هێشتا وەردەکێن کووڤی ژی دناڤ برکێ دا مەلەڤانی دکرن. هێدی هێدی بەفرێ دەستپێکر لێ بێهنا سونێ یا تەنگبوو و هەر دهات و دچوو، پیچەك مابوو بەفر زەڤیا لەڤەنان و گیای هشك ئەوێ کووشکان خوە دناڤ دا ڤەشارتی بنخێڤیت.

وەردەكێن كووڤی یەك ل دووڤ یەكێ ژ برکێ هاتنە دەر و چپکێن ئاڤێ ژ پەڕێن وان دکەڤتن، ل دەستپێکێ سەرکێشێ وان فڕی و پاشی وان ژی دا ب دووڤ ڤە. پشتی وان خۆلەکا فڕینێ ل دورماندور برکێ کری، ژ وی جهی چوون و ل پشت چیایی بەرزەبوون. ڤان وەردەکان بەردەوام ل جهەکێ نوو دگەڕیا داکو لێ بنڤن، لێ پتریا جاران ڤەدگەڕیانە ناڤ زەڤیا لەڤەنان.

سونێ ب باشی تەماشەی ئاسمانی دکر لێ ژبەرکو بەفر ب شێوەیەکێ بلەز دباری ئەو نەدشیا تشتان ژ دوور ڤە ببینیت. هەروەسا ئەو نەشیا وی وەریسێ درێژ یێ ب پێ سەرکەسکی ڤە شۆربووی ببینیت و ب ڤێ چەندێ ئەو نەدشیا وی دناڤ وەردەکێن دی دا بنیاسیت.

— "پێدڤی ناکەت ئەز خوە بترسینم چونکی ئەو وەردەکەکێ چەلەنگە و دزانیت دێ چەوا خوە ژ هێرشێن کووشکی قورتال کەت."

سونێ دڤیا ب ڤان ئاخفتنان دلەکی ل بەر دلێ خوە بدەت لێ ئەو هەر نە یا ئارام بوو و دلێ وێ یێ ب ترس بوو. ئەو چوو دناڤ چالا خوە دا و ڕوونشتە خوار، وێ هیڤی خواست کو ئەڤ شەڤە ڕەڤدەیا وەردەکان بچیتە جهەکێ دی یێ ئارام بنڤن کو دەستێ کووشکی نەگەهیتە وان، وەك ل سەر کەڤرێن بەران یێن بلند یان ل سەر چەقێن دارێن ل بنارێ چیای.

سونێ نوکە یا هەست ب برسێ دکەت ژبەرکو ئەڤە هەیامەکا درێژە ئەو زێرەڤانیا کووشکی دکەت و نەگەهشتیە چ تشتان بخۆت. لێ ژبەرکو ئەوێ خوە فێری کێم خوارنێ کربوو، ئەو دشیا بۆ ماوەیەکێ درێژ هزرا خوارنێ نەکەت و یا برسی بیت ب تایبەت پشتی ژ باخچەی دوور کەڤتی.

وێ هندەك پەڕێن خوە ژی ژ دەستدابوون لێ دیسان دشیا خوە ل بەر ڤێ چەندێ ژی بگریت.

بەفرێ دەم بۆ دەمی بۆشتر لێ دکر و گەلەك کەڤتە سەر یەك، ژبەر هندێ ئێدی ئەو ما دناڤ چالاً خوە دا. هەرچەندە ئەو نەدشیا چ تشتێن ژ دەرڤە ببینیت لێ وێ گوهـ ل دەنگان هەبوو و دزانی کا چ تشت ڕوودەت.

– "چ پێنەڤێت نوکە کووشك گەلەك یێ برسیە و هەر تشتێ بکەڤیتە بەر دەستێن وی دێ خۆت."

بیرا سونێ ل وان شەڤان هات دەمێ وەردەکێ کووڤی هەتا سپێدێ دمایە هشیار و لڤینێن سەیر ئەنجامددان ب تنێ ژ بۆ هندێ داکو هێکا خوە بپارێزیت.

– "ئەز دایکا سەرکەسکی مە و ئەز هەستا دایکینیێ دزانم، ژبەر هندێ ب چ ڕەنگان ئەز ناهێلم کووشك وی بخۆت."

سونێ ژ جهێ خوە ڕابووڤە و ڕێکا خوە دناڤ بەفرێ دا ڤەکر، وێ دیت هێدی هێدی کۆمێن وەردەکان یێ دووبارە بەرەڤ زەڤیا لەڤەنان ڤە دهێن و دێ ل جهەکێ پڕی لەڤەن دادەن داکو بەفر کارتێکرنێ ل وان نەکەت، لێ مخابن کووشکی یا خوە ل بەر وان ڤەشارتی و چاڤەڕێی ڤەگەڕیانا وانە.

ڕەڤدەیا وەردەکان بەرەڤ وی جهی دچوو یێ کووشکی خوە لێ ڤەشارتی، ژبەر هندێ سونێ بلەز کرە غار داکو وان ئاگەهدار بکەت لێ هڕ و بایەکێ دژوار ئەو ل ئەردی دا. دەمێ ئەو ڕابوویەڤە و چاڤێن خوە ڤەکرین، وێ دیت سەرکەسك یێ ل بەر سینگێ وێ ڕاوەستیایە.

سونێ هەست ب کەیفخوەشیەکا مەزن کر کو جارەکا دی سەرکەسك هاتیە دەڤ وێ، هەر یەکسەر وێ پەڕێن خوە ڤەکرن و ئەو هەمبێز کر. هۆسا دیارە ژبەر وێ پارچەیا وەریسی، سەرکەسك گەلەك یێ ماندی و دامایە لێ نوکە پەڕێن وی ژ بەرێ گەلەك بهێزتر لێ هاتینە. ل وی دەمی، دەنگێ ڤێژیەکا بلند دناڤ زەڤیا لەڤەنان دا هات، هەریەکسەر هەموو باڵندە فڕین. سەرکەسك ترسیا و پیچەکێ خوە نێزیکی وی جهی کر،

– "دیسان جارەکا دی کووشکە."

سونێ و سەرکەسکی هەردووکان گوهـ ل دەنگێ وێ ڤێژیێ بوو، هەلبەت ئەڤ چەندە هندێ دگەهینیت کو ئەڤ وەردەکا هاتیە نێچیر کرن دێ دوو کووشکێن برسی تێر کەت. هەروەسان ئەڤ وەردەکا بوویە قوربان دێ بیتە ئەگەر ڕەڤدەیا وەردەکان هەموو وێ شەڤێ ب ئارامی بنڤن.

سونێ ژدل سوپاسیا خودایی کر کو نوکە سەرکەسك یێ ل دەڤ وێ و یێ ب سلامەتە. سەرکەسك زڤڕی دەڤ سونێ و سەرێ خوە دانا سەر پەڕێن وێ و گوت: "ژ نوکە وێ ڤە ئەز خوە ل بەر ڤێ چەندێ ناگرم، دادێ ئێدی من دڤێت دگەل تە بژیم. وەردەکێن هەڤژیێ من دناڤ بازنەیەکا پێکهاتی ژ وەردەکێن دانعەمر دا دنڤن، لێ ئەز ب تنێ ل دووری وان دنڤم، هەتا زێرەڤانێ وان ژی ناهێلیت ئەز خوە نێزیکی وان بکەم. دەمێ ئەز دگەل وان دفڕم ژی ئەز نزانم دێ ل کیڤ جهی بم، چونکی دەمێ ئەز دچمە دگەل ڕێزا باڵندەیێن دانعەمر دا، هەموو ل من دکەنە هەوار و دەمێ دچمە پشت وان ژی ئاخفتنێن کرێت دبێژنە من."

سونیٚ ب دلۆڤانی گوهداریا گازندەیێن سەرکەسکی دکر، ئەو هێشتا یێ بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنێن خوە و گوت: "هەر جهەکێ ئەز بچمێ، ئەز هزر دکەم ئەز یێ بیانی مە، ئەرێ هەتا کەنگی ئەز دێ هۆسا ژیم؟ من ئێدی ژیانا ب ڤی ڕەنگی نەڤێت. دەمێ ئەز و تو پێکڤە دژیان من هەست ب خوەشی و بەختەوەریەکا مەزن دکر، ژبەر هندێ نوکە ئەز یێ زڤڕیم داکو دووبارە پێکڤە بژین."

دەمێ سونیٚ باش تەماشەی لەشێ سەرکەسکی کری، بۆ وێ دیاربوو بەری نوکە وی ژیانەکا نەخوەش و ب زەحمەت دگەل ڕەڤدەیا وەردەکێن کووڤی بوراندیە، لێ دگەل هندێ ژی دەمێ وی پەڕێن خوە ڤەدکرین، دیاربوو کو د ڤی ماوەی دا پەڕێن وی باش یێن پێگەهشتین و نوکە ئەو ب ڕاستی یێ بوویە وەردەکەکێ کووڤی یێ تەمام.

سەرکەسك چوو د وێ چالێ دا یا بەری نوکە وی و سونیٚ بۆ خوە دناڤ شکەڤتێ دا کۆلای و ڤەدا پارچەیا وەریسکی ژی ل دووڤ وی دخشیا و هێلەك ل سەر بەفرێ ل پشت خوە دکێشا، سونیٚ ب دیتنا ڤی دیمەنی گەلەك یا دلتەنگ بوو.

دەمێ سونیٚ سەرکەسك هەمبێزکری، چوو بن گوهێ وی و گوتێ: "خوەشتڤیێ من، ئەڤ شەڤە بۆ خوە تێر بنڤە."

بەفر گەلەك کەڤتە سەر یەك و دەرێ وێ کونا شکەڤتێ هاتە گرتن، د ژوور ڤە وان هەست ب ئارامی و گەرماتیێ دکر. سونیٚ نەنڤست، چونکی وێ بڕیار دا ئەڤ شەڤە پشتی سەرکەسك دنڤیت ئەو ب دمێ خوە وی وەریسکێ ل دور پیٚ وی ئالاندی بقەتینیت.

ب درێژاهیا شەڤێ سونێ دمێ خوە ل وەریسکی ددا، دەمێ دنیا بوویە سپێدە وێ هەستپێکر پیچەکێ دمێ وێ یێ سەلخی، هەروەسا نەدشیا ب سانەهی دەڤێ خوە ڤەکەت و گەلەك یا ماندی بوو و سەرێ وێ دزڤڕی، لێ خوەشبەختانە وەریسك گەلەك یێ لاواز بووی و هەکە پیچەکا دی ئەو خوە پێڤە مژوول بکەت دێ ب یەکجاری ڤەتینیت.

ژ کەیفان دا چاڤێن سەرکەسکی پڕی ڕۆندك بوون دەمێ ژ خەو هشیاربووی و دیتی ئەو وەریسکێ ب پێ وی ڤە چ نەمایە دێ ڤەتیێت. سونێ سەرەکێ وەریسکی گرت و سەرکەسکی سەرێ دی یێ ب پێ وی ڤە ب شێوەیەکێ بهێز کێشا هەتا وەریس ڤەتیایی. سونێ نەشیابوو گرێکا وەریسی ڤەکەت ژبەر هندێ ئەڤ گرێکە وەکو بازنکەکی مابوو د پێ سەرکەسکی، لێ ئەڤ چەندە ئاریشە نەبوو چونکی ئێدی ئەو گرانیا وەریسی هەموو ژ پێ وی ڤەبوو.

پشتی کو شڤێدی هەموویێ ئەو مایە هشیار، سونێ گەلەك یا ماندی و پۆسیدە بوو، سەرکەسك ژی بۆ ماوەیەکی ما ل دەڤ وێ و پشتی هینگێ ئەو دیوارێ بەفرێ یێ دەرگەهێ کونا شکەڤتێ گرتی شەق کر و دەرکەڤت. سونێ ژی ب دوو چاڤێن خەوگرتی ڤە تەماشەی وی دکر دەمێ دفڕی و پاشی یەکسەر کەڤت و د خەو چوو.

– "ئەڤە ژ کەنکی وەرە ئەز یا نڤستی؟"

سونێ ئەڤ ئاخفتنە گوت پشتی کو جارەکا دی سەرکەسك هاتیە دەڤ وێ و ژ خەو هشیار کری.

– "دادێ، دادێ، ژ خەو هشیار بە."

سونێ ب زۆری چاڤێن خوە ژێکڤە کرن، لێ وێ دیت ماسیەکا خوەش و ب تام یا ل بەر سینگێ وێ، هەلبەت ئەو ژی سەرکەسکی یا بۆ وێ ئینای. پشتی سونێ ڕابوویە ڤە و چاڤێن خوە باش ڤەکرین، سەرکەسکی گوتە وێ:

"دادێ تو دزانی شڤێدی کووشکان کی یێن نێچیر کرین؟ شڤێدی وان دوو وەردەك یێن گرتین و خوارین، یەك ژ وان ڕێبەرێ وەردەکان بوو کو کارێ وی ئەو بوو ل جهەکێ ئارام دگەڕیا داکو وەردەکێن دی ب شەڤێ لێ بنڤن، یێ دی ژی زێرەڤانێ وەردەکان بوو ئەوێ ب شەڤێ زێرەڤانی لێ دکر دەمێ دنڤستن. شەڤا بوری، کووشك گەلەك د برسی و بێزاربوون، ژبەر هندێ وان هێرشەکا دژوار کرە سەر ڕێبەر و زێرەڤانێ وەردەکان و هەردوو نێچیر کرن."

د بەر ئاخفتنا سەرکەسکی ڕا، سونێ لەق ل وێ ماسیێ ددان، هەلبەت ئەڤە ژ مێژە وەرە وێ چ خوارنێن هۆسا خوەش نەخوارین و ئەگەر سەرکەسك نەبایە دبیت نوکە ژی ئەڤ ماسیە ل بەر سینگێ وێ نەبا.

— "سوپاس خوەشتڤیێ من بۆ ڤێ ماسیا خوەش و ب تام."

سەرکەسك گرنژی و خوە د سونێ وەرکر، وێ ژی ئەو ب دلەکێ پڕی ڤیان و دلۆڤانی هەمبێز کر و گرنژی، لێ دگەل هندێ هۆسا دیاربوو کو ئەو پیچەکێ یا خەمگینە.

— "دادێ، تو بۆچی یا خەمگینی؟ تە دڤێت ئەز ژ ڤی جهی بار بکەم؟"

- "چ پێنەڤێت، دڤێت تو ژ ڤێرە بچی و یا گرنگ ئەوە نوکە تو دناڤ خێزانا خوە دا بی داکو بزانی کا چ ل دەڤ وان ڕوودەت. ئەگەر من ژی شیانێن فڕینێ هەبان ئەز نەدمامە ل ڤێرێ و دا بارکەمە جهەکێ دی. خوەشتڤیێ من، ئەز نزانم کا دێ چەوا بێی تە ژیم، لێ یا باشتر ئەوە تو نوکە بچیە دگەل خێزانا خوە و ببیە زێرەڤانێ وان چونکی چ وەردەکێن دی وەکی تە د چەلەنگ و شارەزا نینن بشێن ڤێ بەرپرسیاریێ وەربگرن."

سەرکەسکی سەرێ خوە دانا بن پەڕێن سونێ و ڕۆندك ژ چاڤێن وی هاتنە خوار.

- "بەلێ دادێ من نەڤێت بچم و تە بهێلمە ب تنێ."
- " کوڕێ من دڤێت تو وێ بکەی یا گونجایی، هزرێن خوە باش بکە و پرسیارێ ژ دلێ خوە بکە کا تە دڤێت چ بڕیار بدەی."
- "بەلێ پا تو دێ مینیە ب تنێ چونکی تو نەشێی ڤەگەڕیە ناڤ باخچەی ژی؟"
- "تو خەما من هەلنەگرە، ئەز دێ شێم ب تنێ ڤەتینم و ژیانا خوە یا مایی ب ئارامی ببورینم."

سەرکەسکی دەست ب گریێ کر، لێ سونێ ڕۆندکێن وی پاقژ کرن و ئەو شیرەت کر کو دڤێت باڵندەیەکێ دلۆڤان بیت دگەل وەردەکێن دی و هاریکاریا وان بکەت داکو کەس ژ وی نەڕەڤیت.

سەرکەسکی گوت: "ئەم دشێین جهێ نڤستنا خوە ژبەر کووشکی بگوهۆڕین، من یا زانی ڕەڤدەیا وەردەکان دەمێ بەرەڤ چیایی دچن دێ د

سەر برکێ ڕا بورن و هۆسا ب ڤی ڕەنگی ئەز دێ شێم بۆ ماوەیەکێ دی ژی ل ئاسمانی تە ببینم."

سونێ ب ئارامی و بێدەنگی گوهێ خوە ددا پەیڤێن سەرکەسکی، سونێ دزانی ئەو دێ ڤێ چەندێ کەت لێ هۆسا دیارە هێشتا هزرا وی یا ل سەر ڕەڤدەیا وەردەکان و نە یێ ئارامە جارەکا دی بچیتە دگەل وان ژبەرکو دترسیت وەکی بەرێ ژ وی دوور بکەڤن.

– "دایکا من یا خوەشتڤی، ڕاستە ئەز و تو د ژێك جوداینە، لێ ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم."

پشتی گوتنا ڤان ئاخفتنان سەرکەسك ژ وێرێ دەرکەڤت و سونێ ژی ما ب تنێ چونکی نەدشیا ژ جهێ خوە بلڤیت. سەرکەسك جارەکا دی بەری بفڕیت ل دور خوە دزڤڕی و دووبارە خاترا خوە ژ سونێ خواست و پاشی ل هنداڤی برکێ فڕی و گەهشتە باڵندەیێن دی.

سونێ هێدی هێدی ژ چالێ هاتە دەرێ و ل سەرێ گری ڕاوەستیا و تەماشەی سەرکەسکی دکر دەمێ گەهشتیە وەردەکێن دی، دلێ وێ ب ڤێ چەندێ گەلەك یێ خوەش بوو، لێ چ پێنەڤێت چوونا وی دێ خەمەکا دی ل وێ زێدەکەت.

وەرزێ زڤستانێ بەرەڤ دوماهیێ ڤە دچوو و هێشتا هندەك بەفرا نەحەلیایی ل سەر گوپیتکێن چیایی مابوو. ئەو جهێن تیشکا ڕۆژێ دگەهشتیێ، هندەك گول و کولیلکان دەست ب شینبوونێ کربوو. خوارنا هندەك گیای تەڕ و نازك خوە هەکە هێشتا یێ بەستیگرتی ژی بیت، ل ڤی دەمی خوارنەکا گونجایی بوو.

د وەرزێ زڤستانێ دا، سونێ بەردەوام جهێ ڤەحەویانا خوە دگوهارت، خوارن ژی ل ڤی وەرزێ سالێ یا کێم بوو و کووشکی ژی ژ هەموو دەمێن دی پتر نەخوەشی دگەهاندە وێ. ژبەر هندێ سونێ گەلەك یا ل خوە هشیاربوو ب تایبەت دەمێ ژ گری بەرەڤ زەڤیا لەڤەنان و بن وێ دارا شکەستی و دناڤ کۆما پیشی یا زەڤیا برنجی یان دناڤ وێ بەلەما شکەستی دا دچووی.

هەلبەت ئەو پیشێ دناڤ زەڤیا برنجی دا بۆ وێ باشترین وارگەهـ بوو چونکی خوارنەکا مشە لێ هەبوو، لێ ژبەرکو هژمارەکا زێدە یا مشکان لێ هەبوون، ڤێ چەندێ بۆ سونێ نەخوەش کربوو و ئەو نەدشیا بۆ ماوەیەکێ درێژ بمینتە ل وێرێ.

د وی دەمی دا، ژیانا کووشکی ژی نەیا جێگیربوو و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ برسا وی زێدەتر لێ دهات ب تایبەت پشتی جووتیاری سەیەکێ نوو و گەنج ئینایە ناڤ باخچەی بۆ زێرەڤانییێ. هەروەسا هەڤالا وی ژی ژبەر کێمبوونا خوارنێ ئەو دەڤەرە بجهـ هێلابوو و ژ وێرێ بارکربوو لێ کووشکێ ب چاڤەکی هەر ما ل وێرێ.

پشتی ڕەڤدەیا وەردەکان ڕێبەر و زێرەڤانێ خوە ژ دەستداین، هندەك جاران دهاتنە سەر برکا ئاڤێ و مەلەڤانی تێدا دکرن، کووشکی ژی خوە ل بەر وان دڤەشارت و چاڤێ وی ل دەلیڤەیەکا گونجایی بوو، لێ ب ڕاستی ژی نێچیرکرنا وەردەکان ئێدی بۆ وی نە کارەکێ ب سانەهی بوو.

پشتی سەرکەسك بوویە زێرەڤانێ وەردەکان و ب شەڤێ دەمێ ئەو دنڤستن ب ئاوایەکێ باش زێرەڤانی ل وان دکر، ژبەر هندێ ئێدی کووشك

نەشیا خوە وەردەکەکا ب تنێ ژی نێچیر بکەت. نوکە سەرکەسك یێ بوویە زێرەڤانەکێ چەلەنگ و وێرەك و دەنگێ وی یێ گڕ بووی و پەڕێن وی یێن بهێز بووین. ئەو نوکە ئەندامەکێ ڕاستەقینە یێ ڕەڤدەیا وەردەکانە و یێ ژ هەژی یە ئەڤ پۆستە وەرگرتی.

دەمێ بۆ ماوەیەکی وەردەکێن کووڤی نەهاتبانە سەر برکێ، کووشکی بەلا خوە ژ سونێ ڤەنەدکر و بەردەوام ب دووڤ وێ ڤەبوو داکو بگریت و برسا خوە پێ بشکێنیت. هەرچەندە گەلەك پەڕێن سونێ وەریابوون و ئێدی وەکی بەرێ یا بهێز و بلەز نەبوو لێ هەموو جاران دشیا خوە ژ دەستێن کووشکی قورتال بکەت.

پشتی ب دوماهی هاتنا وەرزێ زڤستانێ و حەلیانا بەفرێ، بایەکێ هین و فێنك ب سەر برکێ دا هاتبوو، ئێدی باڵندەیان ب سانەهی مەلەڤانی دناڤ ئاڤێ دا دکرن. سونێ ژی جار جار خوە نێزیکی سەر لێڤێن ئاڤێ دکر داکو سەرکەسکی ژ نێزیك ڤە ببینیت.

ژبەرکو ب درێژاهیا ماوەیێ زڤستانێ ئەو مابوونە دناڤ باخچەی دا و مەلەڤانی نەکربوون، دەمێ وەردەکێن ناڤ باخچەی بەرەڤ برکێ ڤە هاتین هەر یەکسەر چوونە دناڤ ئاڤێ دا و دەست ب کرنا یاریان کر. سەرکێشێ وەردەکان نێزکی سونێ بوو و پشتی سلاڤ کریێ، گوتێ: "چ پێنەڤێت نوکە زڤستان بۆ تە گەلەك یا دژوار و ب زەحمەتبوو."

سونێ ژی ب گرنژین ڤە بەرسڤا سلاڤا وی دا و چ تشتی دی نەگوتێ. سونێ دیت وەردەکێن باخچەی هەموو یێن قەلەو بووین، لێ وێ حەسیدی ب وان نەبر و ل دەڤ وێ تشتەکێ گەلەك ئاسایی بوو.

ل دووڤ دا سەرکێشێ وەردەکان گوتێ: "هۆسا دیارە هێشتا تو یا ب سلامەتی، مەرەما من ئەو نینە کو تو ژ لایێ ڕۆخساڕی و ساخلەمیێ ڤە یا ساخلەمی، بەلکو تشتەکێ دی یێ گرنگ یێ هەی ئەو ژی تو نەوەکی چ مریشکێن باخچەی. تو مریشکەکا زیرەکی و تە باوەریەکا مەزن ب خوە هەیە، هەرچەندە گەلەك پەڕێن تە یێن وەریاین ژی لێ چ کارتێکرن نەکریە سەر ڕۆخساڕێ تە و هێشتا تو یا جوانی."

سونێ دزانی کو ئەو ئاخفتنێن ئەو دبێژیت هەموو د هۆسا نینن، چونکی دیارە ئەوی دڤیا خوە ل بەر سونێ شیرین بکەت. ل دووڤ دا وی پەڕێن خوە ڤەکرن و بەری خوە بهاڤێژیتە دناڤ ئاڤێ دا، پرسیار ژ سونێ کر: "ئەرێ کا تێشکێ تە؟ ئەز ترسم کو ......" مەرەما وی ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو نەکو سەرکەسك مر بیت یان ژ لایێ کووشکی ڤە هاتبیتە نێچیرکرن.

دەمێ وەردەك ل ئاسمانی دفڕین دیمەنێ هەموویان وەك یەك بوو، لێ سونێ دشیا ب سانەهی سەرکەسکی بنیاسیت چونکی نوکە ئەو گەلەك یێ زیرەك بووی و ژ هەموویان بلندتر و بلەزتر دفڕیت. سەرکێشێ وەردەکان تەماشەی ئاسمانی کر و دیت سەرکەسك گەلەك یێ ب کەیفە و یێ هندەك هێمایان بۆ سونێ فرێ دکەت وەك ڕێزگرتن.

سونێ ب سەربلندی و کەیفخوەشی ڤە ل وان جهان دهات و دچوو، ژ نیشکەکێ ڤە وێ خوە دیت ئەو پیچەکێ یا ژ زەڤیا لەڤەنان دوور کەڤتی، دەمێ ئەو ب ڕەخ دارەکا بیهۆکێ ڤە بوری، وێ گوهـ ل دەنگێ قەرەبالغەکا

بلند بوو کو دناڤ کۆمەکا گیای بلند دا دهات، ئەڤ قەرەبالغە دەنگێ گریا هندەك گیانەوەرێن بچووك بوو.

سونێ چوو دناڤ وێ کۆما گیای هشك دا، لێ ژبەرکو ئەو جهـ گەلەك یێ تاری بوو، سونێ ل دەستپێکێ نەشیا چ تشتان بینیت. پشتی هینگێ وێ زێدەتر خوە نێزکی وی دەنگی کر و هێدی هێدی دیمەنەکێ سەیر ل پێش چاڤێن وێ دیار دبوو. سونێ هندەك گیانەوەرێن بچووك دیتن کو هۆسا دیارە ژ نوو یێن ژ دایکبووین چونکی هێشتا چاڤێن خوە نەڤەکرینە و یێن ب هەڤدوو دکەڤن.

دلێ سونێ بلەز خوە قوتا دەمێ وێ ئەو گیانەوەرێن ب چوار پێیان دیتین. لێ هەر زوو ئەو ژ وی جهی دەرکەڤت داکو تووشی چ مەترسیان نەبیت ئەگەر هات و دایك و بابێن ڤان گیانەوەران سونێ ل وێرێ دیت و هزر کر ئەو یا بزاڤێ دکەت زیانێ بگەهینتە زارۆکێن وان.

لێ سونێ مریشکەکا مایتێکەر بوو و حەز دکر هەموو تشتان بزانیت ژبەر هندێ ئەو ما ل نێزیکی وی جهی و پرسیار ژ خوە دکرن، ئەرێ بۆچی دایکا ڤان گیانەوەرێن هێشتا چاڤێن خوە نەڤەکرین ئەو هێلاینە ب تنێ؟ ئەرێ ما هەکە کەس چاڤدێرییێ ل وان نەکەت ئەو نامرن؟ سونێ باش دزانی ئەو گیانەوەرێن ژ نوو ژ دایك دبن، هەکە دایکا وان چاڤێ خوە نەدەتێ دێ هەر زوو مرن.

سونێ ب سەر گری کەڤت و چاڤەرێی هاتنا دایکا ڤان گیانەوەرێن بچووك دکر، لێ هەتا بورینا دەمەکێ درێژ ژی چ گیانەوەر دیار نەبوون. دنیا بوو تاری و وەردەکێن باخچەی ژی هەموویان برك بجهـ هێلا و

وەردەکێن کووڤی ژی هەموو ب جارەکێ فڕیبوون، لێ هێشتا دایکا وان ڤەنەگەڕیایە.

سونێ ژبەر ڤان گیانەوەرێن بچووك گەلەك ب خەم کەڤت. وێ د دلێ خوە دا گوت: "تو بێژی دایکا وان مر بیت؟ تو بێژی وان کەس نەبیت چاڤدێرییا وان بکەت؟"

سونێ ل سەر کرنا ڤان پرسیاران یا بەردەوام بوو هەتا وێ گوهـ ل دەنگێ هاتنا وەردەکان ژ پشت چیایی بووی کو بەرەڤ زەڤیا لەڤەنان دهاتن. ئەو ماوەیەکێ درێژ بوو ئەڤ وەردەکە ب شەڤێ نەهاتینە ناڤ زەڤیا لەڤەنان، ژبەر هندێ ئەو هەر زوو بەرەڤ زەڤیێ چوو داکو سەرکەسکی ل وێری ببینیت.

سونێ مەندەهۆش ما دەمێ دیتی کووشك یێ ل هیڤییا ڕەڤدەیا وەردەکان و یا خوە دناڤ گیایەکێ بلند دا ڤەشارتی، ئانکو هەروەکی کا چەوا بەری نوکە وی خوە ل بەر ڕێبەر و زێرەڤانێ وەردەکان ڤەشارتی بەری وان نێچیر بکەت.

سونێ هەست ب ترسێ کر چونکی نوکە سەرکەسك یێ بوویە زێرەڤانێ وەردەکان و ڕامانا وێ ئەوە ئەو و ڕێبەرێ نوو یێ وەردەکان دێ بەری ڕەڤدەیێ دەنە سەر ئەردی و ئەو دێ بنە ئارمانج بۆ کووشکی.

— "ئەڤە ماوەیەکێ درێژە من کووشك نەدیتی و ئەز یا پشتڕاستم ئەو گەلەك یێ برسی یە، لەوڕا نوکە ئەو گەلەك یێ پۆسیدە بووی و یێ ل هیڤیا نێچیرەکێ."

وەردەك ل ئاسمانی و هنداڤی برکێ دفڕین، سونێ ژی بلەز ژ گری هاتە خوارێ و پەڕێن خوە لێکددان، وێ خۆزی ڕادهێلان کو نوکە ئەو ژی شیابا فڕیبا داکو زوو گەهشتبایە خوارێ ل شوونا ب هەردوو پێن خوە یێن لاواز بکەتە غار.

سونێ گرێلبوو خوارێ و گەلەك برین و سەلخین ل سەر لەشێ وێ پەیدابوون چونکی ئەو ب گەلەك ستریێن گیای هشك و قورمێن داران کەڤتبوو لێ وێ هەست ب ئێشانێ نەدکر چونکی ئارمانجا وێ هەموو ئەوبوو بگەهیتە زەڤیا لەڤەنان بەری کو سەرکەسك دادەتە سەر ئەردی.

سونێ گازی کرە کووشکی: "هێی تو گیانەوەرێ دڕندە، وەرە من ئەز یا ل ڤێرێ."

ل ڤی دەمی سونێ پەڕێن خوە ڤەکرن و گەلەك بەلگێن گیای مابوونە پێڤە، ژبەر هندێ ڕۆخسارێ وێ جهێ پێکەنینێ بوو لێ دەنگێ وێ یێ تیژ بوو و نیشانێن هاراتیێ ل سەر دیاربوون. کووشکی دزانی سونێ دێ بیتە ئەگەرێ ژناڤبرنا پیلانا وی، ژبەر هندێ ژ جهێ خوە ڕابوو و ددانێن خوە ل سەر یەك شداندن و ب دوو چاڤێن تۆڕە و کەرب گرتی ڤە بەرەڤ سونێ هات.

سونێ بۆ هەر ڕوودانەکا نەچاڤەڕێکری یا ئامادەبوو و ژ چ تشتان نەدترسیا. ژ لایەکێ دی ڤە کووشك ژی گەلەك یێ برسی بوو و دیمەنێن لاوازیێ ل سەر لەشێ وی دیار دکرن تا وی ڕادەی دلێ سونێ دما پێڤە. هەلبەت نوکە کووشك نە ئەو نێچیرڤانێ بەرێ یێ بهێزە ئەوێ وەکی بای دکرە غار. چاڤێ سونێ باش ل زك و سنگێ وی یێ لاواز بوو.

– "هەرێ ئەڤە چ ل وی هاتیە؟"

سونێ هەر زوو هزرێن خوە کرن و پرسیار ژ خوە کر ئەرێ کا ب درێژاهیا زڤستانا بوری کووشکی چ تشت خواریە و بۆچی زکێ وی هۆسا تێکچوویە؟ ئەرێ بۆچی ئەو هۆسا هێدی برێڤە دچیت؟

سونێ یەکسەر شیا بگەهیتە بەرسڤا ڤان هەموو پرسیاران، وێ یەکسەر زانی کو ئەڤ گیانەوەرێن بچووك یێن دناڤ وێ چالا دناڤ گیای بلند دا تێشکێن کووشکی نە. هۆسا دیارە ئەڤ کووشکە یا مێ یە و دایکا ڤان گیانەوەرێن بچووکە لێ بەری نوکە وێ ئەڤ چەندە نەدزانی.

ئێدی دەم هاتبوو وەردەکێن کووڤی هەموو دادەنە سەر ئەردی، وەردەکەکی پێن خوە دانانە سەر ئەردی و ل جهەکی دگەڕیا داکو لێ بنڤن. سونێ گرێکەك ل پێ وی وەردەکی دیت و یەکسەر زانی ئەو سەرکەسکە.

کووشکێ کێلبێن خوە ل سەر یەك شداندن و گوتە سونێ: "ئەی مریشکا پیس، هەر نوکە خوە ژ ڕێکا من ڤەدە."

سونێ یا نەچار بوو کارەکێ هۆسا بکەت داکو سەرنجا کووشکێ بۆ لایێ خوە بڕاکێشیت، ژبەر هندێ ئەو بەرەڤ پاشڤە زڤڕی و ب دەنگەکێ بلند گوتێ: "تو یا بێ منەتی چ بکەی، ئەڤە ئەز ژی بەرەڤ تێشکێن تەڤە چووم."

هەر زوو سونێ خوە گەهاندە بن دارا بیهۆکێ و کووشکێ یەکسەر دا ب دووڤ ڤە چونکی دزانی دێ تێشکێن وێ تووشی مەترسیێ بن. هەرچەندە ئەڤ کووشکا مێ د ژیەکێ مەزن دابوو لێ هێشتا دشیا بلەز

بکەتە غار و پیچەك مابوو ئەو بگەهیتە سونێ و گەردەنا وێ ژناڤ یەك بینتە دەرێ.

سونێ هەر بلەز خوە گەهاندە وی جهی یێ تێشکێن کووشکێ لێ کەڤتینە سەر پشتا هەڤدوو و دمێ خوە هاڤێتە تێشکەکا وێ کو هێشتا وەکی پرتەکا گوشتی یا نەرم و بێ پیرت بوو. د ڕاستی دا ئەڤ کارێ دڕندە نە ژ ساخلەتێن سونێ بوو و وێ بەری نوکە زیان نەگەهاندیە چ گیانەوەران، لێ نوکە وێ چ ڕێکێن دی نینن ل دژی کووشکێ بڕاوەستیت.

کووشکێ ب چاڤێ خوە یێ یەکانە تەماشەی سونێ کر. ڤان هەردوو دایکان هند تەماشەی هەڤدوو کر هەتا بێهنێن وان چك بووین. دەمێ تێشکا وێ کریە گری، هەر یەکسەر سەروچاڤێن کووشکێ تێکچوون و هۆسا دیارە ئەو کووشکا ئەڤە ژمێژە دڕاهێلتە سونێ داکو نێچیر بکەت، نوکە یا کەڤتیە بن دلۆڤانیا دمێ وێ و یا هیڤییان ژێ دکەت خوە ژ تێشکێن وێ دوور بکەت.

کووشکێ ب دەنگەکێ نزم ڤە هیڤی ژ سونێ کرن: "هیڤی دکەم بەلا خوە ژ وان ڤەکە و خوە ژێ دوور بکە، ئەو گەلەك د بچووکن و هێشتا چاڤێن خوە نەڤەکرینە."

لێ سونێ سەرێ خوە هەژاند و ب بێمنەتی ڤە گوتێ: "پێدڤی بوو بەری نوکە گەلەك جاران تە ژی بەلا خوە ژ مە ڤەکربا و ل دووڤ مە نەهاتبای لێ تە ئەڤ چەندە نەکر، تە وەردەکا بەفرین و وەردەکێ کووڤی نێچیر کرن و پاشی تو بەردەوام ب دووڤ من و سەرکەسکی ڤە بووی ل دەمەکی کو تو دشیایی بچیە جهەکێ دی نێچیرا خوە بکەی."

کووشکێ ب دلەکێ شکەستی ڤە بەرسڤا وێ دا و گوت: "باوەربکە من چ ڕێکێن دی نەبوون، ل وان هەموو دەمان ئەز گەلەك یا برسی بووم و هوون ژ نیشکەکێ ڤە دکەڤتنە بەر چاڤێن من، پێدڤی بوو ل سەر من ئەز نێچیرا خوە بکەم یان ژی بمرم. هەتا نوکە ژی ئەز و تێشکێن خوە گەلەك د برسینە و هەکە چ نێچیران نەکەم دێ مرین."

- "تو دبێژی کو ئەم ژ نیشکەکێ ڤە کەڤتینە بەر سینگێ تە؟ نەخێر هۆسا نینە چونکی تو بەردەوام ب دووڤ مە ڤە بووی. ژبەر هندێ ئەز دێ نوکە تێشکێن تە یێن کو تو گەلەك حەز ژێ دکەی کوژم داکو تو بگەهیتە سزایێ خۆ."
- "هیڤی دکەم وەنەکە چونکی ئەڤ چەندە نەدادپەروەرییە و تو نوکە نەیا برسی، لێ ئەز ب تنێ ل وی دەمی نێچیرێ دکەم دەمێ ئەز گەلەك یا برسی بم و هەر تشێ ب کێر خوارنێ بهێت ئەز نێچیر دکەم."
- "ب درێژاهییا ژیانا خوە تە یا دایە ب دووڤ من ڤە و ئەز گەلەك یا وەستاندیم، ژبەر تە گەلەك ڕۆژێن نەخوەش و گران یێن ل سەر من ڕا بورین."
- "ئەز باوەر ژ تە ناکەم، چونکی هەتا نوکە بەختێ تە ژ یێ هەموو مریشکان باشتر بوویە چونکی ل هەموو وان جارێن من دڤیا تە نێچیر بکەم ئەز ب سەرنەدکەڤتم، ب ڤێ چەندێ تو شیایی ژیانا خوە هەموویێ ببورینی. ئەز ب تنێ یا وەستیایم و سەحکێ هندی من یا دایە ب دووڤ تەڤە چەند بنێ پێن من یێن پەق پەق بووین."

سونێ پیچەکێ هزرێن خوە کرن و گوت: "باشە هەر چەوا بیت ئەز دێ وێ کەم یا من بڤێت."

ب ڕاستی ژی کووشکێ ڕاست دگوت چونکی چەندین جارێن وێ دایە ب دووڤ سونێ ڤە، ئەو ب زۆری ژ مرنێ ڤەڕەست بوو.

سونێ پیچەکێ هەست ب دلۆڤانییێ کر دەمێ دیتی ئەو تێشکێ وێ ب دمێ خوە گرتی یێ دەستێن خوە دلڤینیت و ل دمێ وێ ددەت، دوور نینە د هەر دەمەکی دا خوین ژ لەشێ وی بهێت، ژبەر هندێ بێی کو کووشك پێ بحەسیت سونێ پیچەکێ هێزا دمێ خوە ل سەر لەشێ وی سڤك کر.

- "باشە تو دێ بەلاٚ خوە ژ سەرکەسکی ڤەکەی ئەگەر من جهەکێ دی نیشا تە دا بچی ل وێرێ نێچیرا خوە بکەی؟"
- " چ پێنەڤێت."
- "سوزێ بدە من کو تو جارەکا دی ب دووڤ وی نەکەڤی، ئەز ژی دێ جهەکی نیشا تە دەم خوارنەکا باش بۆ تە و تێشکێن تە لێ هەیە."
- "ئەز سوزێ ددەمە تە هەر گاڤا من خوارنەکا دی ب دەستخوەڤە ئینا، ئێدی ئەز بەلا خوە ژ سەرکەسکی ڤەکەم."
- "باشە، ڕاستە ئەز یا پیربوویم لێ هێشتا دم و پەنجێن من بهێزن و تو یا ڤێ چەندێ ب چاڤێن خوە دبینی، ڤێجا باش بزانە هەر گاڤا تە سوزا خوە بجه نەئینا دێ تێشکێن تە ژی وەکی تە میننە ب چاڤەکی."

سونێ بەحسێ وێ کۆما پیشێ دناڤ زەڤیا برنجی دا بۆ کووشکێ کر، کەیفا وێ گەلەك هات دەمێ سونێ گوتیێ کو هژمارەکا مەزن یا مشکان ل وێری هەیە و د هەیاما زڤستانا بوری دا گەلەك قەلەو بووینە و نوکە ئەو بەردەوام یێ شەڕی سەرا جهێ ئاکنجیبوونا خوە دکەن چونکی هژمارا وان یا زێدەبووی و جهـ تێرا وان ناکەت. کووشك پیچەکێ یا دوودل بوو ژ ئاخفتنا سونێ، لێ سونێ ئەو پشتڕاست کر کو هەر گاڤا ئەو ژ وێرێ بچیت ئەو ژی دێ تێشکێن وێ بجهـ هێلیت و ژ وان دوور کەڤیت.

کووشك هەرچەندە یا دوودل ژی بوو ژ ئاخفتنێن سونێ، لێ ئەو ل دەستپێکێ ژناڤ وی جهی دەرکەڤت. بەرێ سونێ ما ل کووشکێ کا چەوا ژ بەر سەرما و برسێ یا دلەزریت، ب ڕاستی دلێ وێ وی ژی ما پێڤە ب تایبەت پشتی کو زانی ئەو دایکەکا پۆسیدە و پەریشانە.

ئەڤە ئەو دایکە یا ب شەڤێ هەموویێ دناڤ تاریاتیێ دا ل نێچیرەکێ دگەڕیت داکو بۆ زارۆکێن خوە بێن ساڤا ئەوێن هێشتا چاڤێن خوە نەڤەکرین ببەت. ئەڤە ئەو دایکە یاکو نەشێت بمینتە ساخ ئەگەر دگەل لەزاتیا بای نەکەتە غار و نێچیرەکێ نەکەت. ب ڕاستی ژی نوکە ئەو نێچیرڤانەکا پەریشان و ب چاڤەکی یە.

ئەو جهێن تیشکا ڕۆژێ دگەهشتییێ، گول و کولیلکێن نوو لێ پەیدابوون و ئەڤ چەندە نیشانەك بوو ژ بۆ هاتنا وەرزێ بهارێ. دارێن گێلاسان یێن ل سەرێ گری بەژن و بالاٚ خوە ب گولێن زەر یا خەملاندی.

ڕۆژانە سونێ دچوو سەر برکێ و تەماشەی سەرکەسکی دکر، لێ سەرکەسك قەت بەرەڤ وێ ڤە نەدهات. هەرچەندە سونێ باش دزانی کو کارێ زێرەڤانێ وەردەکان ئەوە بەردەوام زێرەڤانییێ بکەت و جهێ خوە نەهێلیت، لێ دگەل هندێ وێ هەست ب پۆسیدەییێ و تۆڕەبوونێ دکر.

– "خوەشتڤیێ من سەرکەسك، ئەڤە ماوەیەکێ درێژە من تو نەدیتی."

بۆ ماوەیێ چەندین ڕۆژان سەقا یێ ئارام بوو، لێ نوکە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ یێ بەرەڤ خراپتر دچیت. با یێ تەزی دبیت و ئاسمان ژی یێ پڕی ئەور دبیت، هۆسا دیارە جارەکا دی بەفر دێ باریت.

سونێ ب درێژاهییا ڕۆژێ ل وان جهان دهات و دچوو و هەتا وەستیایی ژ نوو زڤڕی سەرێ گری و بۆ ماوەیێ چەندین ڕۆژان ل سەر جهێن خوە نەڕابوو. هندەك جاران ژ دوور ڤە وێ سەرکەسك ل وان جهان ددیت. نوکە وێ دڤێت ئەو ل جهەکی ئاکنجی ببیت چونکی یا ب ناڤسال ڤە چووی و ئێدی نەشێت بەردەوام جهێ خوە بگوهۆڕیت، هەروەسا وێ دزانی جار جار کووشك ژی ب ڕەخ وێ ڤە دبوریت لێ ئەو ژی وەکی بەرێ نەشێت بکەتە غار.

سونێ دەمێ کووشك ددیتی، د دلێ خوە دا دگوت: "هەی ژارێ کووشك، نوکە تو ژی وەکی من یا ب ناڤسال ڤە دچی و یا ب زەحمەتە ب شێوەیەکێ باش چاڤدێریا تێشکێن خوە یێن ساڤا بکەی."

پاشی وێ خوە ل سەر زکی ڕازاند. هندەك پەڕێن وێ ژێ کەڤتن و هەر یەکسەر بای خوە لێدا و دگەل خوە فڕاندن. هەرچەندە نوکە ئەو گەلەك یا وەستیایە و خەوا وێ یا دهێت، لێ هێشتا بەرێ وێ یێ ل برکێ کا دێ وەردەکێن کووڤی چ کەن.

دەمێ دنیا بوویە ئێڤار، وەردەك هەموو ل دور سەرکێشێ خوە خڕڤەبوون و پاشی دەست ب فڕینێ کرن. سونێ قەت هزر نەدکر کو فڕینا وان یا ڤێ جارێ دێ بەرەڤ ئاراستەیێ وەلاتێن باکووری بیت.

هێدی هێدی هڕ و بایێن بهێز ڕابوون و بەرەڤ زەڤیێن هشك ڤە دچوون. بای داڤێن هشك یێن گیای دگەل خوە ڕادکرن و چەقێن داران دلڤاندن. وەردەکان یەك یەکە پەڕێن خوە لێکددان و دەست ب فڕینێ دکرن، کووشك ل دوور وان دزڤڕی و چاڤەڕێی نێچیرکرنا وان بوو.

ل دەستپێکێ سەرکێشێ وەردەکان فڕی و پاشی یێن دی هەموویان یەك یەکە دا ب دووڤ ڤە. سونێ سەرێ خوە بلند کر داکو تەماشەی وەردەکان بکەت دەمێ ل هنداڤ برکێ و گری دفڕین. وێ دیت وەردەکەك ژ ڕەڤدەیا خوە ڤەبوو و بەرەڤ وێ ڤە هات.

سونێ ڕابوو سەر پێن خوە و گوت: "خوەشتڤیێ من سەرکەسك، ئەڤە تو هاتی؟"

سونێ پەڕێن خوە ڤەکرن داکو ب خێرهاتنا وی بکەت، لێ سەرکەسك ل بلنداهیەکا نزم ل هنداڤی سەرێ وێ ما و نەدادا سەر ئەردی، بەلکو وی ژی پەڕێن خوە ل پەڕێن وێ دان وەك نیشانەك ژ بۆ خاترخواستنێ و پاشی هێدی هێدی بلند بوو و ژ وێ دوور کەڤت.

سونێ دزانی کو ئەڤ ڕۆژە دێ هەر هێت یا سەرکەسك خاترا خوە ژێ دخوازیت و دێ وێ هێلیتە ب تنێ، لێ مخابن ئەو نوکە ژ دەڤ وێ چوو بێی کو سونێ هەموو تشتێن بەری نوکە هەست پێ دکری بۆ وی ڤەگێڕیت.

سەرکەسك گەلەك بلند بوو پاشی بلەز پەڕێن خوە لێکددان داکو بگەهیتە ڕەڤدەیا وەردەکان کو پیچەکێ ژ وی دوور کەڤتبوون. نوکە سونێ بیرا خوە ل هەموو وان چیرۆکان دئینا یێن وێ حەز ژێ دکری و وێ ل بەربوو ڕۆژەکێ هەموویان بۆ سەرکەسکی ڤەگێڕیت.

ئەو نەگەهشت ڤان چیرۆکان بۆ وی ڤەگێڕیت، ژبەر هندێ وێ ب دەنگەکێ بلند کرە هەوار: "سەرکەسك، تە بۆچی ئەز هێلامە ب تنێ."

وەردەکێن کووڤی یێن کو بەری نوکە فڕین و ئاسمان هەموو پڕ کری دیار نەمان و بەرزەبوون. هەروەسا دەنگێن وان ژی هێدی هێدی بەرەڤ نەمانێ دچوون. ل دوماهیێ هەموو باڵندە ل پشت چیایەکێ بلند بەرزەبوون. هۆسا دیارە جیهانەکا دی یا هەی و نوکە ئەو دێ بەرەڤ وێرێ چن.

ژ نیشکەکێ ڤە بێدەنگیێ پەڕێن خوە ب سەر وی جهی دا گرتن، سونێ هزر کر لایێ دی یێ جیهانێ هەموو تشتێن زیندی بۆ خوە برن و ب تنێ هندەك گیایێ هشك ل ڤی لایێ جیهانێ ما. نوکە ئەو گەلەك یا وەستیایی و ب زۆری دشێت بێهنا خوە بهەلکێشیت.

سونێ ب کزگریوك ڤە دگوت: "من ژی دڤێت بفڕم، من ژی دڤێت دگەل وەردەکان بچمە لایێ دی یێ جیهانێ."

هەلبەت ئەڤ هیڤییا سونێ ژی هند یا ب زەحمەت بوو هەروەکی کا چەوا ئەو نوکە ب زەحمەت بێهنا خوە دهەلکێشیت. نوکە جارەکا دی ئەو ما ب تنێ، ب ڕاستی ژی ئەو گەلەك حەز ژ ڤێ چەندێ ناکەت و ئەو هەست ب ترسێ دکەت دەمێ دمینتە ب تنێ.

ژ نیشکەکێ ڤە وێ دیت کووشك ل پشت وێ دیاربوو، لێ دیاربوونا وێ هند یا ب ترس نەبوو هندی ئەو ژ مانا ب تنێ دترسیا ژبەر هندێ خوە خیرەت نەکر ژ جهێ خوە ژی ڕابیتەڤە یان بزاڤا ڕەڤینێ بکەت.

سونێ چاڤێن خوە دانانە سەر یەك و گوت: "بەری نوکە من هیڤییەکا ب تنێ هەبوو، هیڤییا من ئەو بوو ئەز هێکەکێ بکەم ول سەر کورك ببم و چاڤەڕێی وێ بم هەتا دمەرقیت، ل دوماهیێ ئەڤ هیڤیا من بجهـ هات. هەرچەندە ژیانا من گەلەك یا نەخوەش و ب ڕەزالەت بوو لێ دگەل هندێ ژی ئەز یا بەختەوەر بووم چونکی ئەز شیام ژبەر ڤێ خەونا خوە بمینمە ساخ.

لێ نوکە، من دڤێت بلند بفرم، من دڤێت وەکی سەرکەسکی بلند بفرم و ژ ڤی جهی بار بکەم، من دڤێت ل ڤێرێ نەمینم و بچمە جهەکێ دوور. ئەرێ بۆچی من ژی بەری نوکە ڕاهێنانێن فڕینێ نەدکرن؟ پانێ سەرکەسکی خوە ب خوە فێری فڕینێ کر هێشتا دەمێ ئەو یێ بچووك.

نەخێر، من ئەڤ چەندە نەدزانی، ڕاستە فڕین یەك بوو ژ خەونێن من، لێ ئەڤ چەندە خەونەکا بێ ڕامان بوو چونکی لەشێ من بۆ هندێ نەهاتیە ئافراندن هەتا پێ بفرم."

سونێ تەماشەی ئاسمانی کر یێ ڤالایە، وێ دووبارە هەست ب پۆسیدەییێ کر. کووشکا ب چاڤەکی بەردەوام بەرێ وێ ل سونێ بوو و قەت بەرێ خوە ژێ وەرنەدگێڕا، لێ چاڤێن سونێ ل وێ نەبوون، بەلکو بەرێ وێ ل ئاسمانی بوو و تەماشەی دوماهیك خالا وی دکر.

دەم بۆ دەمی هندەك چیکێن بەفرێ یێن وەکی پەمبی دبارین. دەمێ چاڤێ سونێ ب ڤان چیکان دکەڤتی کو ب ئاوایەکێ ئارام یێن دبنە مێهڤانێن ئەردی، وێ هەست ب بەختەوەریەکا بێ سنوور دکر.

ل دەمێ ئەو دناڤ باخچەی دا، ل ڤی دەمێ سالێ دارا خەرنۆفێ ژی کولیلکێن خوە وەکی ڤان چیکێن بەفرێ دبارینیت، ژبەر هندێ ئەڤ چیکێن بەفرێ وەکی کولیلکێن دارا خەرنۆفێ دهێنە پێش چاڤێن وێ. وێ پەڕێن خوە هەموو ڤەدکرن داکو هژمارەکا مەزن یا ڤان کولیلکان ل سەر بڕاوەستن و بێهن کەتە بێهنا وان یا خوەش. نوکە بۆ وێ هەموو تشت د ئارامن و هەست پێ ناکەت ئەو یا ب تنێ یە.

بێدەنگیێ خوە ل دور وێ ئالاند، هەموو تشت ب جارەکێ ژ وێ دوور کەڤتن. کولیلکێن دارا خەرنۆفێ فڕین و بێهنا وان بەرزەبوو. چ تشت ژبلی کووشکا برسی ل وێرێ نەمان.

– "ئەز باش دزانم کو نوکە تو یا ل ڤێرێ."

سونێ تەماشەی چاڤێ کووشکا برسی کر و هزرا خوە د تێشکێن وێ یێن نازك و بێ پیرت دا کر. گوشتێ وان یێ تەڕ وەکی دوماهیك هێکا سونێ بوو، ئەو هێکا جووتیاری هاڤێتیە ناڤ باخچەی و شکەستی.

جارەکا دی وێ هەست پێ کر لەشێ وێ هەموو ڕەق بوو. سونێ نەشیا بڕەڤیت چونکی لەشێ وێ بێهێز ببوو و شیانێن ڕەڤینێ ژی نەمابوون.

– "دێ، نوکە تو دشێی من نێچیر بکەی، نوکە زکێ تێشکێن خوە یێن برسی ب گوشتێ من تێر بکە."

سونێ جارەکا دی چاڤێن خوە نقاندن، وێ هەستپێکر کو گەردەنا وێ ژ لەشێ وێ هاتە ڤەقەتاندن. ل دەستپێکێ وێ هزرکر ئەڤ چەندە دێ وێ ئێشینیت، لێ ب ڕاستی ژی بەروڤاژی بوو چونکی نوکە ئەو هەست ب ئارامیەکا مەزن دکەت.

– "و تە ل دوماهیێ ئەز هەر نێچیر کرم."

سونێ چ تشت نەدیتن ژبلی تاریاتیەکا ڕەش و بێ دوماهیك، بەری نوکە ژی دەمێ ئەو دناڤ باخچەی دا وێ هەست ب ڤێ چەندێ کربوو ئەو ژی دەمێ ڤێژیا وەردەکا بەفرین هاتیە گوهێن وێ. هەرچەندە هەموو تشت د تاری بوون، لێ هێدی هێدی ئەڤ دیمەنە دهاتنە گوهۆرین بۆ ڕەنگێ سۆر. نوکە ل شوونا ڕەنگێ ڕەش و تاری ئەو یا ڕەنگێ سۆر دبینیت.

دەمێ سونێ چاڤێن خوە ڤەکرین، وێ ئاسمانەکا بەرفرەهـ ل پێشیا خوە دیت. نوکە ئەو گەلەك یا ئارامە و لەشێ وێ ژی گەلەك یێ سڤك بووی. سونێ پەڕێن خوە یێن مەزن جوان لێکددان و بلند دفڕی و تەماشەی سەر ئەردی دکر.

نوکە ئەو یا تەماشەی ئەردی دکەت و یا هەموو تشتان دبینیت، واهە برکەکا ئاڤێ یا مەزنە و ل دورماندوری وێ زەڤیەکا لەڤەنان یا لێ

**هەی کو ب بەفرێ یا هاتیە نخافتن. هەروەسا ل سەرێ گرێ هە کووشکەکا وەستیایی یا دچیت و مریشکەکا لاواز یا ب دەڤێ خوە هەلگرتی.**

**دوماهیک**



# پرۆفایلێ وەرگێڕی

## دیان جەمیل سالّح

- ل باژێرێ دهۆکێ هاتیە سەر دونیایێ
- دەرچوویێ کۆلیژا زانست پشکا بایۆلۆژی ل زانکۆیا دهۆکێ سالا 2010
- هەلگرێ باوەرنامەیا ماستەرێ یە د زانستێ بۆماوەزانیا خانەیی دا ل سالا 2015
- مامۆستایە ل زانکۆیا دهۆك، کۆلیژا پزیشکی هەر ژ سالا 2012
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا بایۆلۆژییێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا ڕۆژنامەڤانێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- سەرپەرشتێ بەرپەڕێن زانستی و ساخلەمی بوویە ل چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان تایبەت گوڤارێن کوردزووم و پێرومەگەزین.
- کارکریە د کار و چالاکیێن چەندین ڕێکخراوێن نە حکومی دا
- پشکدار بوویە د چەندین کۆڕ و سمینار و وۆرك شۆپێن زانستی و ڕەوشەنبیری و ئەدەبی دا کریە، هندەك ژ وان ژی ژ پێشکێشکرنا نڤیسەری ب خوە بووینە
- ڕابوویە ب ڕێڤەبرنا چەندین پۆستێن ڕۆژنامەڤانی مینا "ڕێڤەبەرێ نڤیسینێ و دەستەکا نڤیسەران، هتد).
- بۆ ماوەیەکی ب وەکالەت ڕێڤەبەرێ ڕێڤەبەریا تەندروستی و سەلامەتی یا سەر ب زانکۆیا هۆکێ ڤەبوویە.

## بەرهەمێن چاپکری و نەچاپکری:

### 1- وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی ژ زمانێ ئینگلیزی بۆ زمانێ کوردی

| ناڤێ پەرتووکێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|
| 1. بایۆلۆژیا گەردی و خانەیی | 2010 | 2012 |
| 2. مایکرۆبایۆلۆژی | 2010 | 2012 |
| 3. فرمانزانی و کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی | 2013 | 2014 |
| 4. بۆماوەزانی | 2013 | 2014 |
| 5. مشەخۆرزانیا پزیشکی | 2013 | 2014 |
| 6. ناڤرێژزانی | 2013 | 2014 |

### 2- وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی و چیرۆکان یێن زارۆکان:

| ناڤێ پەرتووکێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|
| 7. گەریانەك بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤی | 2012 | ــــــــ |
| 8. بۆچی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن؟ | 2012 | ــــــــ |
| 9. سەیروسەمەرێن جیهانا گیانەوەران | 2012 | ــــــــ |
| 10. دیاریا سەرێ سالێ | 2013 | 2013 |
| 11. هیڤیا ماسیێ | 2013 | 2013 |
| 12. بۆچی بۆبی نەوێریت بفڕیت؟ | 2013 | 2013 |
| 13. ڕەوشتێ سلاڤێ | 2016 | ــــــــ |
| 14. ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ | 2016 | ــــــــ |
| 15. ڕەوشتێ کرنا یاریان | 2016 | ــــــــ |
| 16. ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ | 2016 | ــــــــ |
| 17. زەحمەت نەبیت | 2016 | ــــــــ |

3- ئامادەكرن و وەرگێڕانا پەرتووكێن گشتی:

| ناڤێ پەرتووكێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپكرنێ |
|---|---|---|
| 18. 100 كاریگەرترین كەسایەتی د دیرۆكێ دا و ل پێشیا وان محمد (س.خ) | 2015 | ــــــــــ |
| 19. سێكس د چوارچۆڤەیەكێ ڕەوشەنبیری دا | 2016 | 2016 |
| 20. ڤێ بەڤێ بخۆ ! | 2016 | 2016 |
| 21. ئەو مریشكا دڤیایی بفڕیت (ڕۆمان) | 2016 | 2016 |
| 22. ڕەجماندنا سوڕەیایێ (ڕۆمان) | 2016 | 2016 |
| 23. ڕۆژانێن گوهدرێژەكی (فەلسەفە) | 2016 | ــــــــــ |

